# شەرحی

# أصول السنة

دانراوی پێشەوا

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (١٦٤-٢٤١هـ)

ئامادەکردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

چاپی یەکەم

# شەرحی

# أصول السنة

دانراوی پێشەوا

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (١٦٤-٢٤١هـ)

ئامادەکردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

چاپی یەکەم

# پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ لِلّهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاَللّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللّه فَلَا مُضِلّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِي لَهُ وَأَشْهَد أَنْ لَا إِلَه إِلّا اللّه وَحْده لَا شَرِيك لَهُ، وَأَشْهَد أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْده وَرَسُوله.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾(آلِ عِمۡرَان).

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءًۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ١﴾(النِّسَاء).

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾(الأَحْزَاب).

أَمَّا بَعْدُ:

فإنّ أصْدَقَ الحَديثِ كتابُ اللّهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمَّدٍ ﷺ وشرَّ الأمُورِ مُحْدَثاتُها، وكلَّ مُحْدَثَةٍ بدعةٌ، وكلَّ بدعةٍ ضَلالَةٌ، وكلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ؛ وبعد:

ئەم نوسراوە یەکێکە لە نوسراوە گرنگەکانی ئەهلی سوننە و جەماعە کە بە پێنوسی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رحمه الله نوسراوە، کە بە (أصول السنة للإمام أحمد) ناسراوە، ئەبویەعلای حەنبەلی دەڵێت: ئەگەر کەسێك بۆ فێربوونی بچێت بۆ چین زۆری نەکردووە[1]؛ کە کۆمەڵە ڕستەیەکی کورت و پوخت و پڕ مانای زۆر بە سودن سەبارەت بە بنەماکانی ئەهلی سوننە نوسیویەتی، ئەوناوەیان لەسەرەتای نوسینەکەی پێشەوا ئەحمەدەوە هێناوە کە دەڵێت: (**أصُول السّنة عندنَا...**)، لەم کتێبەدا بەڵگەم بۆ بڕگەکانی هێناوەتەوە لە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، و تێگەیشتن و گوتەی زانایانی سوننەشم بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە و دەوڵەمەند کردنی کۆ

(١). (طبقات الحنابلة)(١/٢٤١).



کردووەتەوە، و ناونیشانم لە دەقەکەی ئیمام ئەحمەدەوە بۆ بابەتەکان دەرهێناوە، و ناوی زانایانم بە تەنها ناوی خۆیانەوە هێناوە خوا ڕەحم بە مردووەکانیان بکات و زیندووەکانیان بپارێزێت، و لە پاش ناویان رحمه اللهم نەنوسیوە چونکە ناوەکانیان زۆر دووبارە بووەتەوە، و لە کاتی ئاماژە بۆ هەر سەرچاوەیەك نوسیبێتم "بڕوانە" ئاماژەیە بۆ ئەوەی بە ماناوە ئەو قسەیە نەقڵکراوە و کورت و پوختکراوەتەوە، بەو هیوایەی ڕوونکردنەوەیەکی باش بێت بۆ ئەو بنەمایانەی لەو نوسراوەدا باسکراوە، و موسڵمانانی خۆشەویستی کورد زمانیش بیخوێننەوە و سودی لێ ببینن.

عوسمان ئەحمد حاتەم

٨جمادي الآخرة١٤٤٤هـ

٢٠٢٣/١/١

گەرمیان ـ کەلار

به ناوی خوای میهرەبانی به بەزەیی

شێخی پێشەوا ئەبوموزەفەر عبدالملکی کوڕی محمدی هەمەدانی دەڵێت: شێخ ئەبوعبدالله یەحیای کوڕی حەسەنی کوڕی ئەحمەدی بەنا بۆی گێڕاینەوە دەڵێت: باوکم ئەبوعەلی حەسەنی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبداللەی کوڕی بەنا باسی بۆ کردین دەڵێت: ئەبو حوسێن عەلی کوڕی محمدی کوڕی عبداللەی بشرانی معەدەل باسی بۆ کردین دەڵێت: عوسمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی سەماك هەواڵی پێداین دەڵێت: ئەبومحمد حەسەنی کوڕی عبدالوهابی کوڕی ئەبوعەنبەر باسی بۆ کردین، که خوێندراوەتەوە به سەریدا له کتێبەوە له مانگی ڕەبیعی یەکەم له ساڵی ٢٩٣هـ، دەڵێت: ئەبوجەعفەر محمدی کوڕی سلێمانی مەنقری بەصری له تەنیس که شارێکە له شارەکانی میسر، دەڵێت: عەبدوسی کوڕی مالکی عەتار بۆی گێڕامەوە گوتی: گوێم لێبوو ئەبوعبدالله ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی حەنبەل دەیگوت:

## بنەماکانی سوننەت

**(أصُول السّنة عندنَا: التَّمَسُّك بِمَا كَانَ عَلَيْهِ أَصْحَاب رَسُول الله ﷺ والاقتداء بهم).**

**واتە: بنەماکانی سوننەت لای ئێمە ئەهلی سوننەت و جەماعەت بریتییە لە: دەست گرتن بەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری بوون، و شوێنکەوتنی ڕێبازیان.**

(**أصُول**) کۆی (أصل)ە لە زماندا بە بنەڕەت دەگوترێت کە شتی تری لەسەر بینا دەکرێت و پشتی پێدەبەستێت، عوبید جابری دەڵێت: لە زاراوەدا چەند مانایەکی هەیە:

یەکەم: ڕێسای گشتی (القاعدة العامة): وەك ئەوەی دەڵێن: (الأصل في الأمر الوجوب)، واتە: ڕێسایە کە فەرمان بۆ واجب بوونە.

دووەم: بەڵگە (الدليل): وەك ئەوەی زانایان دەڵێن: ئەصلی نوێژ و زەکات ئەو ئایەتەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴿٤٣﴾﴾(البَقَرَة).

واتە: نوێژەکانتان بەوشێوەیەی کە فەرمانتان پێکراوە ئەنجامبدەن، و زەکاتی سامانەکانتان دەربکەن[(١)].

(**السّنة**) لە زماندا بە ڕێگا و ڕێباز دەگوترێت، خراپ بێت یان باش، و لە زاراوەدا بە چوار مانا بەکاردێت، عبدالمحسن العباد لە لێکدانەوەی فەرموودەی: ((فعليكُمْ بِسُنَّتِي وسنَّةِ الخُلفاءِ المهديِّينَ الرّاشِدينَ))دا دەڵێت: سوننەت بە چوار مانا بەکاردێت فراوانترین و گشتگیرترین مانای بریتییە لە:

یەکەم: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری بووە و ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، وەك ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: ((فَمَن رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي))، واتە: هەرکەسێك پشت لە سوننەتی من بکات لە من نییە، هەروەها ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: ((فعليكُمْ بِسُنَّتِي))، بەم مانایە سوننەت هەموو شتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی دەیگرێتەوە، پەیوەندی بە

---

(١). بڕوانە: (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)(٩).

بیروباوەڕەوە هەبێت یان پەرستشەکان یان هەڵسوکەوت و ئاداب و خورەوشت، ئەمە فراوانترین مانای سوننەتە.

دووەم: بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگوترێت (**السّنة**)، وەك ئەوەی لەسەر پرسێکی دیاریکراو دەڵێن: قورئان و سوننەت و ئیجماع بەڵگەیە لەسەری، ئەگەر (**السّنة**) عەتفکرایە سەر قورئان مەبەست فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

سێیەم: مانای (**السّنة**) لە بەرامبەر بیدعەدا بەکاردەهێنرێت، کە پەیوەندی بە پرسی بیروباوەڕەوە هەیە، کەسێك ئەگەر شوێنکەوتووی ئەوە بێت کە بەڵگەی لەسەر هاتووە پێی دەگوترێت: سونی، و هەرکەسێك پێچەوانەی بێت پێی دەگوترێت: بیدعی، دەگوترێت سوننە و بیدعە، و ئەو کتێبانەی کە دەگوترێت: (**السّنة**) بەم مانایەیە، وەك (**السّنة**) ئیبن ئەبوعاصم، (**السّنة**) لالەکائی، (**السّنة**) تەبەرانی، (**السّنة**) عبداللەی کوڕی ئیمام ئەحمەد، (**السّنة**) ئیمام ئەحمەد، و مەبەست ئەوەیە پەیوەندی بە بیروباوەڕەوە هەیە.

چوارەم: بەكار هێنانی سوننەت لە زاراوەی فەقیهەكان بریتییە لەو كردارەی فەرمانی پێكراوە، فەرمانێك كە واجبی ناكات، فەقیهەكان و ئوصولییەكان بەم شێوەیە پێناسەی دەكەن: ئەو كەسەی ئەنجامی دەدات پاداشتی دەست دەكەوێت، و هەركەسێك ئەنجامی نەدات سزا نادرێت[(١)].

سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەم مانایە سێ بەشە: فەرموودەكانی، كردارەكانی، و دانپێدانراوەكانی (الاقرارات).

عوبێد جابری دەڵێت: مەبەست لە **(السنة)** لێرە بیروباوەڕ و مەنهەجە، **(أصول السنة)**: بریتییە لەوەی كە پشتی پێدەبەسترێت لە ڕێساكان لە بیروباوەڕ و پەرستش و هەڵسوكەوتەكان.... و ئەوەی ئیمام ئەحمەد لە سەرەتای ئەم نامیلكەیەدا دەڵێت: **(أُصول السّنة عندنَا)** مەبەستی هەموو بنەماكانی سوننەت نییە، بەڵكو مەبەستی گرنگترین و

(١). بڕوانە: (شرح الأربعين النووية)(٢٦).

لە پێشترینیانە بۆ گرنگی پێدان، چونکە بنەماکانی سوننەت و مامەڵەکردن لەوە زیاتر کە لەم نامیلکەیەدا هاتووە[(١)].

تێگەیشتن و پەیڕەوکردن و دەستگرتن بە ئاینەوە بەوشێوازەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی تێگەیشتوون و پەیڕەویان کردووە، بنەمایە لای ئەهلی سوونە، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥﴾(النِّسَاء).

واتە: هەرکەسێك ناکۆك بێت لەگەڵ پێغەمبەری خوا و دژایەتی بکات و لێی جیا ببێتەوە، دوای ئەوەی ڕێگای هیدایەتی بۆ ڕوون دەبێتەوە، و شوێنی ڕێگایەك جگە لە ڕێگای باوەڕداران بکەوێت، لێی دەگەڕێین و دەیسپێرین بەو ڕێگا گومڕاییەی کە بۆ خۆی هەڵیبژاردووە و هیدایەتی نادەین بۆ ڕێگای ڕاست، و لە دۆزەخدا دەیسوتێنین، کە ئەوەش خراپترین سەرئەنجامە.

(١). (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)(١٠).



﴿وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئەم بەشەی ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕێبازی باوەڕداران کە پێشەنگیان هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ حەقە، ئەحمەد لە ئیبن مەسعودەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: (ما رَآه المُسلِمونَ حَسنًا فهو عندَ اللهِ حَسنٌ، وما رَآه المُسلِمونَ قَبيحاً فهو عندَ اللهِ قَبيحٌ).

واتە: ئەوەی موسڵمانان بە باشی بزانن ئەوە لای خوا باشە، و ئەوەی کە موسڵمانان بە خراپی بزانن لای خوا خراپە.

ترمزی و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((افْتَرَقَتِ اليَهُودُ عَلى إحْدى وسَبْعِينَ فِرْقَةً أوِ اثْنَتَيْنِ وسَبْعِينَ فِرْقَةً، والنَّصارى عَلى مِثْلِ ذَلِكَ، وتَفْتَرِقُ هَذِهِ الأُمَّةُ عَلى ثَلاثَةٍ وسَبْعِينَ فِرْقَةً، كُلُّها فِي النّارِ إلّا واحِدَةً، قالُوا: من هم يارسول الله؟ قال: هم الذين عَلى وأَصحابي)).



واتە: جوولەکە ناکۆکبوون و بوون بە حەفتا و یەك یان دوو بەشەوە، و گاور ناکۆك بوون بە هەمان شێوە، و ئەم ئوممەتەش ناکۆك دەبێت و دەبێتە حەفتا و سێ بەشەوە، هەموویان لە ئاگردان تەنها کۆمەڵێکیان نەبێت، گوتیان: کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوانەی لەسەر ڕێبازی من و هاوەڵانمن.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی خەلیفە ڕاشدییەکان لەو فەرموودەیەی کە ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی لە عربازی کوڕی سارییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّهُ مَن يَعِشْ مِنكمْ بَعدِي فسَيَرى اخْتلافاً كثيرًا، فعليكُمْ بِسُنَّتِي وسنَّةِ الخُلفاءِ المهديِّينَ الرّاشِدينَ، تَمسَّكُوا بِها، وعَضُّوا عليْها بالنَّواجِذِ، وإيّاكُمْ ومُحدثاتِ الأُمورِ، فإنّ كلَّ مُحدَثةٍ بِدعةٌ، وكلَّ بِدعةٍ ضلالَة)).

واتە: هەرکەسێك دوای من بژی ناکۆکییەکی زۆر دەبینێت، پەیڕەوی سوننەتەکەم و سوننەتی خەلیفە ڕاشدییە هیدایەتدراوەکان بکەن، توند دەستی پێوە بگرن، و بە کاکیلەکانتان گازیان لێ بگرن، و وریای شتە

داهێنراوەکانبن، چونکە هەموو داهێنراوێك بیدعەیە، و هەموو بیدعەیەك گومڕاییە.

(**أَصْحَاب رَسُول الله** ﷺ) هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوەڵ ئیبن حەجەر لە (نخبة الفكر)دا پێناسەکی (جامع و مانعی) کردووە و دەڵێت: صەحابی کەسێکە کە گەشتبێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ و باوەڕی پێ هێنابێت و لەسەر ئیسلام مردبێت، ئەگەر لەو ماوەیەدا تووشی هەڵگەڕانەوەش بوو بێت (ردة) لەسەر بۆچوونی صەحیح.

لە بەشەکانی کۆتایدا ئیمام ئەحمەد باسی هاوەڵان دەکات لەوێ بە درێژی باسی فەزڵیان دەکەم.



## هەموو بیدعەیەك گومڕاییە

**(وَترك الْبدع، وكل بِدعَة فَهِيَ ضَلَالَة).**

**واتە: بنەمایەکی تر لە بنەماکانی ئەهلی سوننە بریتییە لە: وازهێنان لە بیدعەکان، و هەموو بیدعەیەك گومڕاییە.**

بیدعە لە زماندا هەموو شتێکە داهێنرابێت لە پێشدا هاوشێوەی نەبووبێت، بەڵام لە زاراوەی شەرعدا هەموو کردار و گوفتارێکە بەڵگەی لە قورئان و سوننەتی صەحیح و ئیجماعی لەسەر نەهاتبێت.

وازهێنان لە بیدعەکان واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جار لە گوتارەکانیدا دەیفەرموو: ((خَيرَ الهَدي هَدْيُ محمَّدٍ ﷺ وشرَّ الأمُورِ مُحْدَثاتُها، وكلَّ مُحْدَثَةٍ بدعةٌ، وكلَّ بدعةٍ ضَلالَةٌ، وكلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ))[١].

---

(١). أخرجه أحمد والنسائي والبيهقي و صححه الألباني.

واتە: باشترین هیدایەت هیدایەتی محمدە ﷺ، و خراپترین شت داهێنراوەکانن، و هەموو داهێنراوێك بیدعەیە و هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، و هەموو گومڕاییەك لە ئاگردایە.

بۆ زانستخوازان و بانگخوازان پێویستترە لە هەموو بیدعەیەك دووربن و خەڵکیشی لێ ئاگادار بکەنەوە، و هەندێك بۆ ڕەواجدان بۆ هەندێك بیدعە کە کردەوەی پێدەکەن چەواشەکاری دەکەن، دەڵێن: ئەگەر وابێت زۆر شت بیدعەیە، و دەبێت دەست لە زۆر هەڵبگرین، بێئاگا لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن أحْدَثَ فِي أمْرِنا هَذا ما لَيْسَ فِيهِ، فَهُوَ رَدٌّ))[1]، وفي رواية مسلم: ((مَن عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليه أمْرُنا فَهو رَدٌّ)).

واتە: هەرکەسێك شتێك لە ئاینەکەی ئێمەدا دابهێنێت ڕەت دەکرێتەوە و لێی قەبوڵ ناکرێت؛ و لە ڕیوایەتێکدا: هەرکەسێك کردەوەیەك ئەنجام بدات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەت دەکرێتەوە.

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەم فەرموودەیە پێناسەی شەرعی بیدعەیە، کەواتە: داهێنان لە شەرعدا بیدعەیە نەوەك لە ئیشوکاری دونیا.

ئەوەی دەڵێت: هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، و دوو سودی گرنگی لیَ دەکرێت:

یەکەم: هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، واتە: هیچ بیدعەیەك چاك نییە وەك هەندێك بانگەشەی ئەوە دەکەن و دەڵێن: ئەمە بیدعەیەکی چاکە.

پێشەوا مالك دەڵێت: هەرکەسێك لە ئیسلامدا بیدعەیەك دابهێنێت و بە باشی بزانێت، بانگەشەی ئەوەی کردووە محمد ﷺ خیانەتی لە گەیاندنی پەیامەکەی کردووە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ٣﴾(المَائِدَة).



واتە: ئەمڕۆ من ئاینەکەم بۆ کاملّ کردن، ئەوەی لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ئاین نەبووبێت ئەمڕۆ نابێتە ئاین[1].

دووەم: هەموو بیدعەیەك حەرامە، و بیدعە دابەش نابێت بەسەر پێنج حوکمە شەرعییەکەدا.

نەوەوی لە لێکدانەوەی: ((كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ)) دەڵێت: ئەمە گشتییەکی تایبەتکراوە، زمانزانەکان دەڵێن: بیدعە هەموو شتێکە لە پێشدا وێنەی نەبووبێت، و زانایان دەڵێن: بیدعە پێنج بەشە: واجب، سوننەت، حەرام، مەکروهـ، و حەڵاڵ[2].

ئیبن باز لەسەر ئەم قسەیەی نەوەوی دەڵێت: کۆمەڵێك لە زانایان باسیان کردووە، پاشان دەڵێت: زانایانی تر دەڵێن: هەموو بیدعەیەك گومڕاییە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی[3].

---

(١). (الاعتصام)(٢٨/١).
(٢). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(١٥٦/٦).
(٣). بڕوانە: (مجموع الفتاوى)(١٧٨/٥).

و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: بێگومان هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، و بیدعە لە ئایندا دابەش نابێت بۆ چەند بەشێك، بەڵكو هەموو خراپ و گومڕاییە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە كۆتای ئەو فەرموودەی كە نەسائی ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ((وكلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ))، پێویستە مرۆڤ بە ئەدەب بێت لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ، و پێش خوا و پێغەمبەرەكەی نەكەوێت بە هیچ كردار و گوفتارێك، و شتێك نەهێنێتە نێو ئاینەوە كە لە ئایندا نەبێت، و شتێك نەكات بە شەرع بۆ نەفسی خۆی كە خوا و پێغەمبەرەكەی پێی ڕازی نەبن، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًاۚ ۝٣﴾(المَائِدَة)، واتە: ڕازی بووم كە ئیسلام ئاینتان بێت[1].

و خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝٦٣﴾(النُّور).

(١). (فتاوى نور على الدرب)(٢/٤).

واتە: بابترسن ئەو کەسانەی سەرپێچی فەرمانی دەکەن کە تووشی بەڵا و ناڕەحەتی یان هاوبەش بڕیاردان ببنەوە، یان تووشی سزایەکی زۆر بە ئێش و ئازاربن.

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی دەڵێن: هەندێك بیدعە هەیە باشە، و هەندێکیان دەڵێن: بیدعە دابەش دەبێت بەسەر پێنج حوکمەکەدا، و ئەوەی صەحیحە پێچەوانەی ئەو قسەی ئەوانە، چونکە بیدعە پێی دەگوترێت بیدعە ئەگەر لە ئاییندا بوو، بەڵام ئەگەر لە ئیشوکاری دونیا بوو پێی ناگوترێت بیدعە.

و پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە پیتاندنی دار خورما فەرمووی: ((أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأُمُورِ دُنْياكُمْ))[١].

واتە: ئێوە زاناترن بە ئیشوکاری دونیاتان.

ئەوەی ئیشوکاری دونیایە پێی ناگوترێت بیدعە، بەڵکو بەوەی لە پەرستش و عیبادەتدا داهێنراوە دەگوترێت بیدعە[٢].

(١). أخرجه مسلم.
(٢). (شرح أصول السنة)(٥٢).

## مشتومڕ نەکردن و دانەنیشتن لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکان

**(وَترك الْخُصُومَات فِي الدّين، وتَرك الجُلُوسِ مَعَ أصْحابِ الأهْواءِ).**

**واتە: لە بنەماکانی مەنهەجی ئەهلی سوننەیە: وازهێنان لە مشتومڕکردن لە ئایندا، و وازهێنان لە دانیشتن لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکان.**

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ ١٤٠﴾(النِّسَاء).

واتە: بە ڕاستی لە قورئاندا ئایەتمان دابەزاندووە بە سەرتاندا، کاتێك بیستتان ئایەتەکانی خوا کوفریان پێدەکرێت و گاڵتەیان پێدەکرێت، لەگەڵیان دامەنیشن هەتاکو لە باسێکی تردا ڕۆدەچن، ئەگەرنا ئێوەش وەك ئەوانن.

و دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٦٨﴾(الأنعام).

واتە: کاتێك بینیت کەسانێك قسە لەسەر ئایەتەکانی ئێمە دەکەن و تیایدا ڕۆدەچن و گاڵتەیان پێدەکەن، لەگەڵیان دامەنیشن هەتاکو لە باسێکی تردا ڕۆدەچن و باسەکە دەگۆڕن، و ئەگەر شەیتان لە بیری بردیتەوە دوای بیرهاتنەوەت لەگەڵ کۆمەڵی ستەمکاران دامەنیشە.

تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾ هاوشێوەی ئەم ئایەتانە لە قورئاندا، فەرمانی خوایە بۆ باوەڕداران کە تەبابن، و یاساغییان لێدەکات لە ناکۆکی و جیاوازی، و هەواڵیان دەداتێ کە ئوممەتەکانی پێشوو بە هۆی مشتومڕەوە لە ئایندا تیاچوون.

و قورتبی دەڵێت: ئەگەر کەسێك زانی کەسێکی تر خراپەکارە و ئامۆژگاری لێ وەرناگرێت، پێویستە لەسەری پشتی لێ هەڵبکات لەبەر

ئەو کردەوە خراپەی و نابێت لەگەڵی دابنیشێت، و ئیبن العەرەبی دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسانەی تاوانە گەورەکان ئەنجام دەدەن دروست نییە، و ئیبن خوەیزمنداد دەڵێت: هەر کەسێك لە ئایەتەکانی خوادا مشتومڕ بکات و ڕۆبچێت دانیشتنی لەگەڵ ناکرێت وپشتی لێ هەڵدەکرێت (هجر) باوەڕداربێت یان بێباوەڕ، و دەڵێت: هەروەها هاوەڵەکانمان یاساغییان کردووە گەشت بکرێت بۆ وڵاتی دوژمنان و چوونە نێو کڵێسا و پەرستگاکانیان، و یاساغی دانیشتنیان کردووە لەگەڵ بێباوەڕان و بیدعەکاران، و نابێت گوێیان لێ بگیرێت و مشتومڕیان لەگەڵدا بکرێت، و هەندێك لە بیدعەکاران بە نەخعییان گوتووە: تەنها بۆ وشەیەك گوێم بۆ بگرە، لە وەڵامدا دەڵێت: نیو وشەشت لێ نابیستم، هەروەها ئەیوبی سختیانیش وای گوتووە، و فوزەیلی کوڕی عیاز دەڵێت: هەرکەسێك بیدعەکارێکی خۆش بوێت، خوا کردەوەکانی پووچەڵ دەکاتەوە و ڕووناکی ئیسلام لە دڵی دەردەهێنێت، و هەرکەسێك کچەکەی لە بیدعەکارێك مارە بکات ئەوە سیلەی ڕەحمی پچڕاندووە، و هەرکەسێك لەگەڵ بیدعەکارێکدا دابنیشێت هەرگیز دانایی پێنابەخشرێت، و هەرکەسێك ڕقی لە خاوەن

بیدعە بێت ئومێدم وایە خوا لە تاوانەکانی خۆش بێت[١]؛ و شەوکانی دەڵێت: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾ مانای ئەوەیە ئەگەر بینیت کەسانێك لە ئایەتەکانمادا ڕۆدەچن و بە درۆی دەزانن و ڕەتی دەکەنەوە و گاڵتە و لاقرتی پێدەکەن، وازیان لێ بهێنە و لەگەڵیان دامەنیشە بۆ بیستنی ئەو تاوانە گەورەیە، هەتاکو باسەکەیان دەگۆڕن و لە باسێکی تردا ڕۆدەچن، خوا فەرمان دەکات بە دوورکەوتنەوە لە دانیشتن لەگەڵ ئەو کەسانەی سوکایەتی بە ئایەتەکانی خوا دەکەن، هەتا ئەو کاتەی واز لەو باسانە دەهێنن، ئەمە ئامۆژگارییەکی گەورەی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی لەگەڵ موبتەدیعەکان دادەنیشن کە مانای فەرموودەی خوا ﷻ دەگۆڕن و یاری بە ماناکانی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن، و بەلای حەز و ئارەزوو و بیدعە خراپەکانیاندا دەیشکێننەوە، ئەگەر نکولی ئەوە نەکرێت کە تێیدا ڕۆچوون، دەبێت بە لایەنی کەمەوە لەگەڵیان دانیشتن نەکرێت ئەوەش ئاسانە و هیچ گران نییە، دانیشتن لەگەڵ بیدعەکاران جگە لەوەی پێیان

---

(١). بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن)(١٢/٧).

خۆشە، گومان لای خەڵكیش دروست دەكەن، بەوەش بە دانیشتن لەگەڵیان خراپەیەكی زیاتری هەیە لە تەنها بیستنی خراپە، ئێمە لەو دانیشتنە نەفرەتیانەمان زۆر بینیوە، حەقمان سەرخست و پووچەڵ ونارەواییەكانمان وەلامدایەوە بە گوێرەی توانامان، هەركەسێك شارەزای ئەم شەریعە پاك و بێگەردە بێت باش دەزانێت كە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی بیدعە گومڕاكارەكان چەندان هێندە خراپەی زیاترە لەو كۆڕانەی كە هەندێك حەرامی تێدا ئەنجام دەدرێت، بە تایبەت بۆ ئەو كەسانەی كە زۆر دامەزراونین و شارەزایی زۆریان نییە لە زانستی قورئان و سوننەتدا، چونكە لەوانەیە تووشی درۆ و وڕێنەكانیان بێت و لە دڵیدا جێگیربێت ئیدی قورسە چارەسەر بكرێت، بەوەش هەتاكو كۆتایی ژیانی كردەوەی پێدەكات و بەوشێوەیە دەگاتە دیداری خوا كە باوەڕی وایە ڕاستە، بەڵام لە هەموو پووچەڵێك پووچەڵترە و لە هەموو خراپەیەك خراپترە[1].

---

(١). (فتح القدير)(١٤٦/٢).

ئەحمەد و ئەبوداود لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن سَمِعَ بالدَّجّالِ فليَنْأَ عنه ما استطاعَ، فإنّ الرَّجُلَ يَأتيه وهو يَحسَبُ أنّه مؤمنٌ، فما يَزالُ به حتى يَتْبعه لما يرى مَعَه مِنَ الشُبُهات)).

واتە: هەرکەسێك بیستی دەجال دەرچوو لێی دووركەوێتەوە چەندە دەتوانێت، چونكە كەسێك دێت بۆ لای واگومان دەبات باوەڕدارە، بەوشێوەیە لەگەڵیدا دەبێت هەتاكو شوێنی دەكەوێت لەبەر ئەو گومانانەی پێیەتی.

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: ئیبن بەتە: لەسەر ئەو فەرموودەیە دەڵێت: ئەمە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ كە ڕاستگۆ و پشتڕاستكراوەیە، بۆیە لەبەر خوا ئاگاداربن ئەی كۆمەڵی موسڵمانان، كەس لە ئێوە گومانی باشی بە نەفسی خۆی پاڵنەری نەبێت، و ئەوەی دەیزانێت لەسەر دروستی مەزهەبەكەی، بۆ ئەوەی ئاینەكەی بخاتە مەترسییەوە و دابنیشێت لەگەڵ هەندێك لە خاوەن ئارەزووەكان، و بڵێت: كۆ دەبمەوە لەگەڵیدا و مشتومڕی لەگەڵدا دەكەم، بۆ ئەوەی لە

مەزهەبەکەی دەربازی بکەم، چونکە فیتنەیان لە دەجال ترسناکترە، و قسەیان لە گەڕی پێست کێشەترە، و سوتێنەرترە بۆ دڵ لە ئاگر، و کۆمەڵە خەڵکێکم بینی نەفرەتیان لێ دەکردن و جنێویان پێ دەگوتن لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیان و دانیشتن لەگەڵیان بۆ ئەوەی نکولییان لێ بکەن و ڕەدیان بدەنەوە، بەردەوام لەگەڵیاندا درێژەیان پێدا فێڵیان شاراوەبوو و کفریان زۆر ورد بوو هەتاکو بە لایاندا شکانەوە.

و ئەنەس رضي الله عنه کەسێك هات بۆ لای گوتی: ئەی ئەبو حەمزە گەیشتم بە کەسانێك شەفاعەت و سزای گۆڕیان بە درۆ دەزانی، گوتی: ئەوانە درۆزنن لەگەڵیان دامەنیشە.

و لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما هاتووە دەڵێت: لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکان دامەنیشە، چونکە دانیشتن لەگەڵیان دڵەکان نەخۆش دەخات.

و ئەبو جەوزا کە یەکێکە کە گەورەی تابعییەکان دەڵێت: ئەگەر مەیمون و بەراز دراوسێم بێت پێم خۆشترە لەوەی کەسێك لە خاوەن ئارەزووەکان دراوسێم بێت.

و فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: لەگەڵ کەسی خاوەن بیدعە دامەنیشە، چونکە من دەترسم نەفرەتت بەسەردا دابەزێت.

و دوو کەس چوون بۆ لای محمدی کوڕی سیرین لە خاوەن ئارەزووەکان، گوتیان: ئەی ئەبوبەکر، فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕینەوە، گوتی: نەخێر، گوتیان: ئایەتێکت لە قورئان بەسەردا دەخوێنینەوە؟ گوتی: نەخێر، هەڵدەستن بڕۆن یان من هەڵدەستم، دەرچوون ڕۆیشتن، کەسێك کە لای دانیشتبوو گوتی: ئەی ئەبوبەکر چی دەبوو ڕێگات بدایە ئایەتێکی قورئانت بەسەردا بخوێنێتەوە؟ گوتی: من ترسام ئایەتێکم بەسەر بخوێننەوە و ماناکەی تێکبدەن، ئەوە لە دڵمدا جێگیر ببێت.

و عبدالرزاق دەڵێت: ئیبراهیمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبویەحیا پێی گوتم: دەبینم موعتەزیلە لای ئێوە زۆرن، گوتم: بەڵێ، ئەوان دەڵێن: تۆش لەوانیت؟! گوتی: بۆچی نایەیتەژوورەوە بۆ ئەو دوکانە هەتاکو قسەت لەگەڵدا بکەم، گوتم: نەخێر، گوتی: بۆچی؟ گوتم: چونکە دڵ لاوازە و ئاین بۆ ئەو کەسە نییە کە سەردەکەوێت.

و موبەشری کوڕی ئیسماعیلی حەلەبی دەڵێت: بە ئەوزاعی گوترا: پیاوێك دەڵێت: من لەگەڵ ئەهلی سوننە و ئەهلی بیدعەش دادەنیشم، ئەوزاعی گوتی: ئەو کەسە دەیەوێت حەق و باتڵ یەکسان بکات.

و ئەهلی بیدعە و ئارەزووەکان چەند نیشانەیەکیان هەیە پێی دەناسرێنەوە، لەوانە:

١ . قسەی نەشیاو کردن بە زانایان، ئەبوحاتەمی ڕازی دەڵێت: نیشانەی ئەهلی بیدعە ئەوەیە قسەی نەشیاو بە زانایان دەڵێن.

٢ . زۆر ڕقیان لە ئەهلی فەرموودەیە و بێدەنگن لە تاوانباران و پووچەڵکاران، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەسفی خەوارجدا دەفەرموێت: ((يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإِسْلامِ وَيَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ))[١].

واتە: موسڵمانان دەکوژن، و وازدەهێنن لە بتپەرستان.

ئەبوعوسمانی صابونی دەڵێت: نیشانەی ئەهلی بیدعە ڕوون و ئاشکرایە، و لە ڕوونترین نیشانەکانیان ئەوەیە زۆر ڕقیان لە هەڵگرانی

(١). أخرجه البخاري ومسلم.



فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، و سوکایەتیان پێدەکەن، و ناویان دەنێن بە حەشەویە و نەفام و زاهیرییە و موشەبیهە، باوەڕیان وایە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ جیاوازە لە زانست، و زانست ئەوەیە شەیتان بەسەریاندا دەیخوێنێتەوە، لە بەرەئەنجامی عەقڵە خراپ بووەکەیانە، و وەسوەسەی تاریکی دڵیان، و ترسی دڵیان کە بە تاڵە لە خێر، و ئەو شتانەی دەیکەنە بەڵگە بە کەڵك نایەت ئەو کەسانە خوا نەفرەتی لێکردوون.

٣ . داوای یارمەتی دەکەن لە کاربەدەستان بە هۆی لاوازی بەڵگەی ئەهلی بیدعەوە و مەزهەبەکەیانەوە پشت دەبەستن بە دەسەڵاتداران بۆ سەرخستنی بانگەوازەکەیان چونکە جۆرێك لە زۆرلێکردن و ترساندنی تێدایە.

٤. هەوڵدان و زیادەڕۆیی لە پەرستندا: کەسی موبتەدع زۆر هەوڵدەدات بۆ ئەوەی لە دونیا ناوبانگ و پلەوپایە و سامان و جۆرەکانی تری ئارەزووەکان بە دەست بهێنێت...، نابینی ڕاهبەکان لە کڵێساکان خۆیان یەکلای کردووەتەوە و لە هەموو خۆشگوزەرانییەکان خۆیان

گرتووەتەوە و نارەحەتی دەچێژن و دەستیان لە ئارەزووەکان هەڵگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە هەمیشەی لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ ۝٢ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ۝٤﴾(الغَاشِيَة).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵە ڕوخسارێك زەلیلە بە سزا، و ماندوو و هیلاکە بە هۆی کردار کردنەوە، ئاگری زۆر بە تین و بڵێسەداری دۆزەخ دەیسوتێنێت.

و دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ۝١٠٣ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ۝١٠٤﴾(الكَهْف).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ دەربارەی ئەو کەسانەی ڕەنج بە خەسار و زیانمەندن، و کردەوەکانیان بە فیڕۆ چووە،

ئەو کەسانەن کە هەوڵ و تەقەلایان لە ژیانی دونیا بە هەدەر و زایە چووە، لە کاتێکدا خۆیان دڵنیابوون کە کردەوەی باشیان ئەنجامداوە.

ئەوەش لەبەر ئەوەیە ئاسانییەك دەبینن لەو خۆ وابەست کردنە، و چالاکییەك لە ناخیاندا هەیە ئەو کردەوە سەختانە بە ئاسان دەبینن، بە هۆی ئەو ئارەزووەوە کە لە نەفسیدایە، ئەگەر کەسی موبتەدع ئەوەی پەیڕەوی دەکات خۆشەویست بوو لای، چی ڕێگریەتی دەستی پێوە نەگرێت و زیاتر پێوەی پابەند نەبێت، وادەبینێت کردەوەکانی باشترە لە کردەوەکانی تر و بیروباوەڕەکانی بالاترە: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ ٣١﴾(المُدَّثِّر).

واتە: بەوشێوەیە خوا کێی بوێت گومڕای دەکات، و کێی بوێت هیدایەتی دەدات.

هەندێك تووشی فیتنە دەبن بە هۆی دەرخستنی دونیا نەویستی و لە خوا ترسان و گریان و پەرستشی زۆریانەوە، ئەمەش پێوەرێکی صەحیح نییە بۆ ناسینی حەق، پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی ئەهلی بیدعی

کردووه بۆ هاوەڵانی و دەفەرموێت: ((یَحقِرُ أحَدُکم صَلاتَه عِندَ صَلاتِهم، وصیامَه مَع صیامِهِم، وقراءتُهُ عِندَ قرائتهم))[(١)].

واتە: کەسێك لە ئێوە نوێژەکەی خۆی بەکەم دەزانێت کاتێك نوێژی ئەوان دەبینێت، هەروەها ڕۆژوو و قورئان خوێندنیان.

و دیارترین نیشانەکانی ئەهلی سوننەت بریتین لە:

١ . بانگەواز کردنیانە بۆ لای کتێبەکەی خوا، واتە: شوێنکەوتن و کردار پێکردنی.

٢ . بە فەرموودە و ئەسەر تەفسیری دەکەن، واتە: بە سوننەت و تەفسیری هاوەڵان و تابعییەکان.

٣ . بانگەواز دەکەن بۆ سوننەتی صەحیح کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە.

---

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

٤ . بیروباوەڕیان وایە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونکەرەوە و ڕاڤەکاری قورئانە.

٥ . خوشویستنی سوننەت و شوێنکەوتووان و هەڵگرانی، و باوەڕیان وایە ئەوانن بە هۆیانەوە خوا ئاین دەپارێزێت، و خوا ﷻ دڵی ئەهلی سوننەی ڕازاندووەتەوە و ڕووناکی کردووەتەوە بە خۆشویستنی زانایانی سوننەت وەك فەزڵێك لە لای خۆیەوە، گوترا بە ئەبوبەکری کوڕی عەیاش: کەسی سوننی کێیە؟ گوتی: ئەگەر باسی کەسانی خاوەن ئارەزوو بکەیت تۆڕە نابێت بۆ هیچ شتێکیان.

٦. مامناوەندن لە نێوان وشکی و ڕۆچوون و زیادەڕۆی و کورتڕەوی.

٧. ڕۆناچن لە کەس لە پێشەواکانیان هەتاکو بە مەعصومیان بزانن نەلە هاوەڵان و نەلە جگە لەوانیش.

٨. ڕقیان لە ئەهلی بیدعەیە، و پەرستشی خوا دەکەن بە تێکۆشان لە دژیان و ڕوونکردنەوەی حاڵ و بیدعەکەیان هەتاکو خەڵك لە بیدعەکەیان بترسێت و لێیان دوور بکەونەوە.

٩ . گرنگی دەدەن بە بیروباوەڕ و پێشی دەخەن بەسەر فەزائیلەکاندا بە پێچەوانەی موبتەدعەکان[١].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ مِنْهُ ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَـٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ۝٧﴾(آلِ عِمْرَانَ).

واتە: ئەوە خوایە کە قورئانی بەسەردا دابەزاندوویت کە ئایەتی موحکەم و ڕوون و ئاشکرای تێدایە و بنەمای قورئانن، و هەندێك ئایەتی تری تێدایە ماناکانی لێکچووە و ڕوون و ئاشکرا نییە و چەند لێکدانەوەیەك هەڵدەگرن، ئەو کەسانەی دڵیان نەخۆشە و لایانداوە لە ڕێگای ڕاست شوێن ئایەتە مانا لێکچووەکان دەکەون بۆ ئەوەی خەڵك گومڕا و چەواشە بکەن و ئاشوب بنێنەوە و لێکدانەوەی هەڵە بۆ

(١). بڕوانە: (شرح أصول السنة)(٥٣-٦٠)



ماناکانی بکەن، و کەس مانای ئەو ئایەتانە نازانێت خوا نەبێت، و ئەوانەی کە ڕۆچوون لە زانستدا و دامەزراون دەڵێن: باوەڕمان هەیە کە هەمووی لە پەروەردگارمانەوە دابەزیوە، تەنها ئەو کەسانە بیر دەکەنەوە و تێدەفکرن کە ژیرن و خاوەن هۆش و بیرن.

ئیبن کەسیر دەڵێت: قورئان ئایەتی موحکەمی تێدایە کە بنەمای قورئانن و ماناکانی ڕوون و ئاشکران، و هیچ شاراوەییەك نییە لە ماناکەیدا لای خەڵك، و ئایەتی تری تێدایە موتەشابهن و ماناکانی لێکچووە و ڕوون نییە لای زۆربەی خەڵك یان هەندێکیان، ئەو کەسەی بۆ تێگەیشتن لە مانای ئایەتە لێکچووەکان گەڕایەوە بۆ لای مانای ئایەتە ڕوونەکان، و حوکمی ئایەتە موحکەمەکانی دایەسەر ئایەتە مانا لێکچووەکان ئەوە هیدایەتی وەرگرتووە، بەڵام هەرکەس پێچەوانەی بکاتەوە گومڕا دەبێت، ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ ڕاڤەکارانی قورئان دوو بۆچوونیان هەیە لە لێکدانەوەیدا، هەندێکیان دەڵێن: ئایەتە موتەشابهەکان کەس مانای نازانێت خوا نەبێت، تەبەری ئەم بۆچوونەی هەڵبژاردووە، و هەندێکیان دەڵێن: ئەو ئایەتە موتەشابهانە تەنها خوا مانای دەزانێت و ئەو زانایانەش کە

ڕۆچوون لە زانستدا و دامەزراون ماناکانیان دەزانن، ئیبن کەسیر دەڵێت: ئیبن عەباس رضي الله عنهما گوتی: من لەو کەسانەم کە ڕۆچووم لە زانستدا و لێکدانەوەی ئەو ئایەتانە دەزانم، و ئیبن ئەبونەجیح لە موجاهیدەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ئەو کەسانەی کە ڕۆچوون لە زانستدا لێکدانەوەی ئەو ئایەتانە دەزانن و دەڵێن: باوەڕمان پێیان هەیە، و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەروا دەڵێت[1].

بوخاری ومسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧﴾، فەرمووی: ئەگەر کەسانێکت بینی شوێن ئایەتە مانا

(١). بروانە: (تفسير القرآن العظيم)(٦/٢).

لێکچووە نادیارەکان دەکەوتن ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا ناوی هێناون و مەبەستییەتی، وریایان بە.

و ئەحمەد لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: من و براکەم لە کۆڕێك دانیشتین حەزناکەم ئەو کۆڕە بگۆڕمەوە بە باشترین جۆری حوشتر کە حوشتری سورە، ڕۆیشتین بینیمان کۆمەڵێك لە هاوەڵە بەتەمەنەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر دەرگایەك لە دەرگاکانی یەکێك لە ژوورەکانی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتوون، پێمان ناخۆشبوو لێکیان جیابکەینەوە، لە پەنایەکی نزیکیان دانیشتین، باسی ئایەتێکی قورئانیان کرد، بووە ناکۆکیان لەسەر ماناکەی هەتاکو دەنگیان بەرز بوویەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرچوو تورە بوو ڕوخساری سورهەڵگەڕا بوو، بە مشتی خۆڵی تێ دەگرتن، و دەیفەرموو: خزمینە هێوربن، بەم ناکۆکییە ئوممەتەکانی پێش ئێوە فەوتان و تیاچوون کە ناکۆك بوون لەسەر پێغەمبەرەکەیان، و هەندێك مانای کتێبەکانیان دژ بە هەندێکی تر لێکدایەوە، بێگومان قورئان دانەبەزیوە بۆ ئەوەی هەندێکی هێندەکەی تری بە درۆ بخاتەوە، بەڵکو هەندێکی ئەو

هێندەکەی تر پشت ڕاست دەکاتەوە ودەیسەلمێنێت، ئەوەی کە زانیتان لە قورئان ئیشی پێبکەن، وئەوەش کە ماناکەیتان نەزانی بیگەڕێننەوە بۆ لای ئەو کەسەی کە زانایە بە لێکدانەوەی ماناکەی.

و ئەحمەد لە ئەبوئومامەی باهلییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ﴾ فەرمووی: ئەوانە خەوارجەکانن، ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لایەنیکەم گوتەی ئەو هاوەڵەیە و ماناکەی ڕاستە، چونکە یەکەم بیدعە کە سەری هەڵدا لە ئیسلامدا فیتنەی خەوارج بوو، وسەرەتاکەیان بە هۆکاری دونیاوە بوو کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتەکانی شەڕی حونەینی دابەش کرد، بە عەقڵی کورتی خراپیان وایان بینی کە بە دادگەرانە دابەشی نەکردووە.

و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سَيَكونُ في آخِرِ أُمَّتي أُناسٌ يُحَدِّثُونَكُمْ ما لَمْ تَسْمَعُوا أنتُمْ ولا آباؤُكُمْ، فإيَّاكُمْ وإيَّاهُمْ)).

واتە: لە ئاییندەدا کەسانێك پەیدا دەبن، کۆمەڵ قسەیەکتان بۆ دەکەن ئێوە و بابوباپیرانیشتان نەتان بیستووە، وریا و ئاگاداریانبن.

شێخ ڕەبیع دەڵێت: کەسانێك هەیە نەفامن و هەڵخەڵەتێنراون و تۆش زانستت هەیە و بەڵگەت بە دەستەوەیە، بانگەوازیان دەکەیت بۆ زانست و بۆیان ڕوون دەکەیتەوە ئاساییە لەگەڵیان دابنیشیت، بەڵام لەگەڵیان دابنیشت وەك ئەوەی هاوەڵ و هاوڕێتبن و خۆشەویستی و تێکەڵاوی و هاوشێوە ئەو هەڵسوکەوتانەیان لەگەڵ بکەیت، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە سەردەکێشێت بۆ گومڕایی، و پێویستە لەسەر کەسی عاقڵ لێی دوورکەوێتەوە، و هەندێك لە هاوەڵان خەڵکیان ترساندووە و ئاگادار کردووەتەوە لە دانیشتن لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکان وەك ئیبن عەباس، و هەندێك لە پێشەواکانی تابعییەکان وەك ئەیوبی سیختیانی و ئیبن سیرین[1].

ئاجڕی و ئیبن بەتە لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: (لا تُجالِسْ أهْلَ الأهْواءِ، فَإنَّ مُجالَسَتَهُمْ مَمْرَضَةٌ لِلْقُلُوبِ).

---

(١). (شرح أسول السنة)(١٦).

واتە: لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکاندا دامەنیشە، دڵنیابە دانیشتن لەگەڵیان دڵەکان نەخۆش دەخات.

و دارمی و ئیبن بەتە لە ئەبوقیلابەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: (لا تُجالِسُوا أهْلَ الأهْواءِ، ولا تُجادِلُوهُمْ، فَإنِّي لا آمَنُ أنْ يَغْمِسُوكُمْ فِي ضَلالَتِهِمْ، أوْ يَلْبِسُوا عَلَيْكُمْ ما كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ).

واتە: لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکان دامەنیشن، و مشتومڕیان لەگەڵ مەکەن چونکە دەترسم لە گومڕاییەکەی خۆیاندا نقومتان بکەن، یان ئەوەی دەیزانن بیشێوێنن.

و ئیبن بەتە لە موجاهیدەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (لا تُجالِسُوا أهْلَ الأهْواءِ، فَإنَّ لَهُمْ عُرَّةٌ كَعُرَّةِ الجَرَبِ).

واتە: لەگەڵ خاوەن ئارەزووەکان دامەنیشە چونکە هەرکەسێك لەگەڵیان دابنیشێت ئەو نەخۆشییەی خۆیانی بۆ دەگوێزنەوە، کە وەك گەڕی وایە.

## مشتومڕ نەکردن لە ئایندا

**(وتَرْكُ المِراءِ والجِدالِ، والخُصُوماتِ فِي الدِّينِ).**

واتە: لە بنەمای ئەهلی سوننەتە وازهێنان لە مشتومڕ و موناقەشەکردن و ناکۆکی لە ئایندا.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۝٤﴾(غَافِر).

واتە: کەس مشتومڕ و چەندوچوون ناکات لە ئایەتەکانی خوا جگە لەو کەسانەی بێباوەڕان.

و دەفەرموێت: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ۝٥٨﴾(الزُّخْرُف).

واتە: ئەو نموونەیەت بۆ ناهێننەوە بۆ مشتومڕکردن نەبێت، بەڵکو ئەوانە کەسانێکن مشتومڕ لەسەر باتڵ دەکەن.

و ئەحمەد و ترمزی و ئیبن ماجە لە ئەبوئومامەی باهلییەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ما ضلَّ قومٌ بعدَ هدًى كانوا عليهِ إلّا أوتوا الجدلَ)).

واتە: هیچ گەلێك گومڕا نابن دوای ئەوەی لەسەر هیدایەت بوون، ئیللا مشتومڕ و چەندوچوونیان پێدەبەخشرێت.

بوخاری و مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە ﵂ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أبْغَضُ الرِّجالِ إلى اللهِ الألَدُّ الخَصِمُ)).

واتە: بێگومان بێزراوترین پیاو لای پەروەردگار ئەو کەسەیە کە کەللەڕەق و هۆگری دەمەدەمکردنە بۆ ئەوەی پووچەڵ سەربخات.

و ئەحمەد لە (الزهد) و ئیبن بەتە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە ڕیواتیان کردووە دەڵێت: (مَن جَعَلَ دِينَهُ غَرَضًا لِلْخُصُوماتِ أكْثَرَ التَّنَقُّلَ).

واتە: هەرکەس ئاینەکەی بکاتە جێگای مشتومڕ جێگیر نابێت و زۆر دەگۆڕێت.

و ئاجڕی و ئیبن بەتە لە حەسەنەوە ڕیوایەتیان کردووە پیاوێك پێی گوت ئەی ئەبوسەعید: (تَعالَ أُخاصِمُكَ فِي الدِّينِ، فَقالَ الحَسَنُ : أمّا أنا فَقَدْ أبْصَرْتُ دِينِي، فَإنْ كُنْتَ أضْلَلْتَ دِينَكَ فالتَمِسْهُ).

واتە: وەرە مشتومڕ بکەین لە ئایندا، لە وەڵامیدا گوتی: من لە ئاینەکەمدا بەرچاو ڕوونم، ئەگەر تۆ ئاینەکەت هەڵە کردووە و گومڕای بوویت بڕۆ بیدۆزەرەوە.

ئایا هەموو جۆرە مشتومڕێك خراپ و ڕێگە پێنەدراوە، زەید مەدخەلی دەڵێت: مشتومڕ دوو جۆرە: جۆرێك فەرمانی پێکراوە و ئەو کەسەی پێی هەڵدەستێت پاداشتی دەستگیر دەبێت، ئەویش مشتومڕکردنە بۆ ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی حەق، و ڕەتکردنەوەی باتڵ بە بەڵگەکانی قورئان و سوننەت، ئەمە ئەو جۆرەیە کە خوا ڕوخسەتی پێداوە، بەم فەرموودەیە: ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾(النَّحل)، و ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾(العَنكَبُوت).

و مشتومڕێکی خراپ کە لە سیفەتی ئەهلی بیدعە و گومڕاکانە، و

پێش ئەوانیش سیفەتی بێباوەڕانە بە خوا ﷻ، ئەویش مشتومڕ کردنە بە باتڵ بۆ پووچەڵکردنەوە و شێواندنی حەق، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ٤﴾(غَافِر).

واتە: کەس مشتومڕ و چەندوچوون ناکات لە ئایەتەکانی خوا جگە لەو کەسانەی بێباوەڕان، گەڕان و گەشتیان بە شار و وڵاتاندا فریوتنەدات[1].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥﴾(النَّحل).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بانگەواز بکە بۆ لای ڕێگای پەروەردگارت بە دانایی و ئامۆژگاری جوان، و بە باشترین شێوە مشتومڕیان لەگەڵدا بکە، بێگومان پەروەردگارت زانایە کێ گومڕا بووە لە ڕێگاکەی، و زانایە

---

(١). (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)(٢٥).

بەو کەسانەی کە هیدایەتیان وەرگرتووە.

تەبەری دەڵێت: ﴿بِٱلۡحِكۡمَةِ﴾ بریتییە لەوەی دابەزیوە بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ، لە قورئان و سوننەت[(١)]؛ و ئیبن کەسیر دەڵێت: هەرکەسێکیان پێویستی بە مشتومڕ و گفتوگۆ لەگەڵ کردن بوو، بە باشترین شێوە لەگەڵیاندا بدوێ، بە نەرمونیانی و لەسەرخۆیی و قسەی جوان[(٢)].

و دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ ٤٦﴾.

واتە: گفتوگۆ و مشتومڕ لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا مەکەن بە باشترین شێوە نەبێت، جگە لەوانەیان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردووە.

(١). (جامع البيان)(٢٣١/١٧).
(٢). (تفسير القرآن العظيم)(٦١٣/٤).

ئیبن کەسیر دەڵێت: قەتادە و جگە لەویش دەڵێن: ئەم ئایەتە نەسخکراوەتەوە بە ئایەتی شمشێر، و بوار بۆ گفتوگۆ لەگەڵیاندا نەماوە، یان دەبێت موسڵمانبن یان دەبێت سەرانە بدەن (جزیە) یان شەڕیان لەگەڵدا دەکرێت، و هەندێکی تر دەڵێن: ئەو ئایەتە موحکەمە بۆ ئەوانەیان دەیانەوێت بەرچاوڕوونیان بدرێت دەربارەی ئاین، بەباشترین شێوە گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکرێت، بۆ ئەوەی سودی هەبێت، وەك خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٢٥﴾(النَّحل)، و بە پێغەمبەران موسا و هارون کاتێك ناردیانی بۆ لای فیرعەون فەرموو: ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ٤٤﴾(طه)، ئەم بۆچوونە تەبەری هەڵیبژاردووە و لە ئیبن زەیدەوە گێڕاویەتییەوە،... ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ﴾ ئەوانەیان لە حەق لادەدەن، و خۆیان لە بەڵگەی ڕوون کوێر

دەكەن، و نكولی دەكەن و خۆبەزلزانن، ئەوكاتە لە گفتوگۆوە دەگۆڕێت بۆ شەڕ بەرپاكردن[١].

ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی و حاكم لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: ((جاهِدُوا المُشْرِكِينَ بِأمْوالِكُمْ وأنْفُسِكُمْ وألْسِنَتِكُمْ)).

واتە: تێبكۆشن لەگەڵ هاوبەش بڕیاردەران بە سامان و نەفس و زمانتان.

محمد ئەسیوبی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە مشتومڕی لەگەڵ هاوبەش بڕیاردەراندا واجب كردووە وەك چۆن بەخشینی سامان و تێكۆشانی لە پێناوی ڕێگای خوادا واجب كرد[٢].

و صەنعانی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە جیهاد بە زمان پێویست كردووە بە ساغكردنەوەی بەڵگە بەسەریانەوە، و بانگەواز كردنیان بۆ لای خوا سبحانه وتعالى[٣].

---

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٢٨٣/٦).
(٢). (مشارق الأنوار الوهاجة)(١١٣/٢).
(٣). (سبل السلام)(٤٦٠/٢).

و شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە دەڵێت: ڕەگەزی مشتومڕ بە حەق جارێك واجبە و جارێك سوننەتە[١].

و شێخ ڕەبیع دەڵێت: زۆر مشتومڕ مەکە، لە شوێنێکدا نەبێت دەبینیت سودی هەیە بۆ ئەو کەسەی داوای دەکات، کەسێك دەیەوێت قسەت لەگەڵدا بکات بۆ ئەوەی بگاتە حەق و لەوە دڵنیا بوویتەوە گفتوگۆی لەگەڵدا بکە: ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾(النَّحل)[٢].

ئەوەی لە قسەی زانایانەوە دەردەکەوێت، مشتومڕ لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە بە چەند مەرجێکە، یەکەم: ئەو کەسەی گفتوگۆ و مشتومڕ دەکات زانستی هەبێت بەو پرسەی قسەی تێدا دەکات، دووەم: لەگەڵ کەسانێکی نەفام و هەڵخەڵەتێنراودا بێت کە گومانی ئەوە بکرێت ئەگەر حەقیان بۆ ڕوون بکرێتەوە بگەڕێنەوە، بۆ قۆڵبادان و سەرخستنی قسە و مەزهەب و بۆچوونی باتڵ نەبێت.

---

(١). (درء تعارض العقل والنقل)(١٧٤/٧).
(٢). (شرح أصول السنة)(١٤).

## سوننەت بەڵگەی قورئانە

**(والسّنة عندنا آثار رَسُول الله، وَالسّنة تفسر الْقُرْآن وَهِي دَلَائِل الْقُرْآن).**

واتە: سوننەت لای ئێمە ئاسارەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، و سوننەت قورئان تەفسیری دەکات، و بەڵگەی قورئانە.

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: ئاساری پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەست ئەوەیە ڕیوایەتکراوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە گوفتار و لە کردار و دانپێدانانەکانی.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ۝٢﴾(الجُمُعَة).

واتە: خوایە کە پێغەمبەرێکی بۆ گەلی نەخوێندەوار لە خۆیان ڕەوانە کردووە، ئایەتەکانی خودایان بەسەر دەخوێنێتەوە، و فێری قورئان و دانای سوننەتیان دەکات؛ کتێب قورئانە، و حیکمەت بریتییە لە سوننەتی پێغمبەری خوا ﷺ.

و پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ألا إنِّي أُتيتُ القُرآنَ ومِثلَه معه))[1].

واتە: بزانن و دڵنیابن من قورئانم پێبەخشراوە و هاوشێوەی ئەویش کە سوننەتە لەگەڵیدا پێم بەخشراوە.

خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە ﷺ ئەوەی لە قورئاندا دابەزیوە بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، بۆ نموونە نوێژ بە کورتی باسی هاتووە لە قورئاندا، و سوننەت ژمارەی ڕکات و کات و کامە فەرزە و کامە سوننەتە ڕوونی کردووەتەوە[2].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾(النَّحل).

---

(١). أخرجه أحمد وأبوداود وصححه الألباني.
(٢). (شرح أصول السنة)(٦٣).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندووە، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە ئەوەی کە بۆیان دابەزێنراوە، بەڵکو تێڕابمێنن و بیربکەنەوە و پەند و ئامۆژگاری وەربگرن.

و دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَـٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾(النِّسَاء).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا و کاربەدەستانتان بکەن، ئەگەر لە شتێك ناكۆك بوون بیگەڕێننەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە چاکترین کردارە، ئەو گەڕانەوەیە بۆ لای قورئان و سوننەت گەڕانەوەیە بۆ لای باشترین سەرچاوە بۆ چارەسەری ناكۆكییەكان.

نموونەی بەشەكانی سوننەت عوبید جابری دەڵێت: سوننەتی گوتار،

وەك ئەو فەرموودەیەی دەفەرمویٚ: ((بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ))[1].

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج شت بونیات نراوە.

و سوننەتی کرداری: ئەوەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە ڕوونکردنەوەی نوێژ و وەستان و ڕکوع و سوژدە و جگە لەوانەش.

و سوننەتی دانپێدانان (التقرير): کردارێك لە پێش چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامدرابێت، یان زانی بێت دانپیێدا نابێت، نموونەی ئەوە: ((أن خالد بن الوليد رضي الله عنه أكل الضبّ على مائدةِ رسولِ اللّهِ ﷺ فلم ينكر عليه[2]))[3].

واتە: خالیدی کوڕی وەلید بزنمژەی لەسەر خوانی پێغەمبەری خوا ﷺ خوارد نکولی لێنەکرد.

---

(١). أخرجه البخاري ومسلم.
(٢). أخرجه البخاري ومسلم، شێخ ئەم فەرموودەیە بە مانا هێناوە.
(٣). (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)(٢٥).



## لە بیروباوەڕدا قیاس نییە

**(ولَيْسَ فِي السّنة قِياس ولا تضرب لَها الأمْثال ولا تدْرك بالعقول ولا الأهْواء وإنَّما هُوَ الإتباع وترك الهوى).**

**واتە: لە سوننەتدا قیاس نییە، و نموونەی بۆ ناهێنرێتەوە و بە عەقڵ و ئارەزووەکان دەرکی پێناکرێت، بەڵکو شوێنکەوتن و وازهێنانە لە ئارەزوو.**

پێناسەی قیاس لە زماندا مانای: ئەندازە و یەکسانییە، لە (مختار الصحاح)دا، قیاس: واتە: ئەندازەی شتێکی بە شتێکی تر گرت، و بە هاوشێوەی تەقدیری کرد، و لە زاراوەدا: مەرداوی دەڵێت: قازی و ئەبوخەتاب و ئیبن البنا دەڵێن: گەڕانەوە فەرعە بۆ بنەماکەی بە هۆی عیلەیەکەوە کە کۆیان دەکاتەوە[1].

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: **(لَيْسَ فِي السّنة قِياس)** مەبەست ئەوەیە لە بیروباوەڕ و دەقەکانی بیروباوەڕدا قیاس نییە، بیروباوەڕ قیاسی تێدا ناکرێت، بەڵکو قیاس لە حوکمە فەرعییەکاندا دەکرێت، ئەبوهورەیرە

---

(١). (التحبير شرح التحرير)(١٣١٧/٧).

ﭬ فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەت کردووە سەبارەت بە دەست نوێژ گرتن لەو شتەی ئاگری بەرکەوتووە و بە ئاگر لێدەنرێت، هاوەڵێك پێی گوت: (ألا أَمَرتَهُم أَن يتوضئوا مِنَ الحَميم "أي: الماءُ الحار"، فقال: يا بن أَخي إذا حدَّثتُكَ عن رسولِ اللَّهِ ﷺ بحديثٍ، فلا تَضرِبْ لَهُ الأمثالَ)[1].

واتە: بۆچی فەرمانیان پێناکەیت دەستنوێژ لە ئاوی کوڵاویش بگرن دوای ئەوەی بە کاریدەهێنن، گوتی: کوڕی برام ئەگەر فەرموودەیەکم لە پێغەمبەر خواوە ﷺ بۆ گێڕایتەوە، نموونەی بۆ مەهێنەرەوە.

و پێغەمبەری خوا ﷺ نکولی کردووە لە حەملی کوڕی نابیغە کاتێك گوتی: ((كيف أغْرَمُ يا رسول الله مَن لا شرِبَ ولا أَكَلَ، ولا نطَقَ ولا استهَلَّ؟ فمِثلُ ذلك يُطَلُّ، فقال النَّبيُّ ﷺ: أَسَجْعٌ

(١). أخرجه الترمذي وابن ماجه وحسنه الألباني، و أخرج أبو داودَ والنَّسائيُّ وغيرُهما عن جابرٍ ﭬ و صححه الألباني، قال: ((كان آخِرُ الأَمْرينِ من رسولِ ﷺ تَرْكَ الوُضوءِ ممَّا مَسَّتِ النَّارُ))، عبدالمحسن العباد لە (شرح سنن أبي داود)دا دەڵێت: ئەم فەرموودەیە فەرموودەکەی پێشی نەسخ کردووەتەوە.

كَسَجْعِ الكهان؟، و في رواية: إنّما هذا مِن إخوانِ الكُهّانِ مِن أجْلِ سَجعِهِ الذي سجَعَ))[1].

واتە: چۆن خوێنی منداڵێکم پێدەبژێردێت کە نەهیچی خواردووەتەوە و نەهیچی خواردووە، و نە قسەی کردووە و دەنگی لێوە هاتووە، هاوشێوەی ئەوە بە زایە دەچێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قسەیەکی سەروادار (سجع) وەك قسەی ئەو کەسانە دەکەیت کە باسی پەنهان دەکەن؛ و لە ڕیوایەتێکی تردا: ئەمە برای ئەو کەسانەیە کە باسی پەنهان دەکەن لەبەر ئەو قسە سەروادارەی کە کردی.

بەو بەڵگانە نابێت کەسێك نموونە بۆ سوننەت بهێنێتەوە، بۆ ئەوەی دەربازی بێت لەو حوکمە و کردەوەی پێنەکرێت، ئەگەر بەندە فەرموودەیەکی بە سەنەدێکی صەحیح بیست، پێویستە لەسەری باوەڕی پێی هەبێت، و نموونەی بۆ نەهێنێتەوە، بۆ ئەوەی خۆی دەرباز بکات لەو سوننەتە، یان بیەوێت پێچەوانەی بکات لەبەر بۆچوونی تر، بەڵکو پێویستە باوەڕی پێی هەبێت ئەگەر پێچەوانەی عەقڵیشی بوو.

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

بۆ نموونە ئەو فەرموودەیەی بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ دەڵێت: ((جاء ملَكُ الموتِ إلى موسى لِيقبِضَ رُوحَه فقال له: أجِبْ ربَّك فلطَم موسى عيْنَ ملَكِ الموتِ ففقَأ عيْنَه فرجَع ملَكُ الموتِ إلى ربِّه فقال: يا ربِّ أرسَلْتَني إلى عبدٍ لا يُريدُ الموتَ وقد فقَأ عيني فردَّ اللهُ عليه عيْنَه فقال له: ارجِعْ إليه فقُلْ له: الحياةَ تُريدُ فإنْ كُنْتَ تُريدُ الحياةَ فضَعْ يدَك على متنِ ثَورٍ فإنَّك تعيشُ بكلِّ شَعرةٍ وارَتْ يدُك سنةً قال: ثمَّ مَهْ؟ قال: الموتُ قال: فالآنَ مِن قريبٍ ثمَّ قال: ربِّ أَدْنِني مِن الأرضِ المُقدَّسةِ رَمْيةً بحجرٍ، قال رسولُ اللهِ ﷺ: لو أنِّي عندَه لَأرَيْتُكم قبرَه إلى جَنْبِ الطَّريقِ عندَ الكثيبِ الأحمرِ)).

واتە: فریشتەی گیان کێشان نێردرا بۆ لای پێغەمبەر موسا ﵇ بۆ ئەوەی ڕوحی بکێشێت، پێی فەرموو: وەڵامی پەروەردگارت بدەرەوە، پێغەمبەر موسا زللەیەکی لێدا چاوی دەرکرد، فریشتەکە گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری گوتی: پەروەردگارا منت ناردووە بۆ لای بەندەیەك مردنی ناوێت، و چاوی دەرکردم، خوا ﷻ چاوی بۆ گەڕاندەوە و فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆ لای بەندەم و پێی بڵێ: ژیانت دەوێت؟ ئەگەر

ژیانت دەوێت دەستت بخە سەر پشتی گایەك، چەندە موو لە ژێر دەستتدایە، بە ژمارەی ئەو مووانە ئەوەندە ساڵ دەژیت، پێغەمبەر موسا فەرمووی: دوای ئەوە؟ فریشتەکە گوتی: پاشان دەمریت، فەرمووی: ئێستا گیانم بکێشە، پەروەردگارا نزیکم بکەرەوە لە سەرزەمینی پیرۆز (بیت المقدس) بە دووری هاویشتنی بەردێك، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر من لەوێ بوومایە گۆڕەکەیم پیشان دەدان، لای ڕێگایەکە لای تەپۆڵکە سورەکە.

لەوانەیە هەندێك خەڵك بە دوور زانینی ئەمە پاڵنەریان بێت بە ڕاستی نەزانن بە عەقڵیان و بە درۆی دابنێن، لە کاتێکدا بوخاری لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە و دروست نییە بۆ هیچ موسڵمانێك بە درۆی بزانێت[(١)].

و ڕەبیع مەدخەلی دەڵێت: هەندێك کەس ڕۆچوون لە قیاسدا، و دەڵێت: ئەم دەقە پێچەوانەیە لەگەڵ بنەماکاندا، و ئەم دەقە پێچەوانەیە لەگەڵ قیاسدا، و لە قیاسدا ڕۆچوون، ئیمام ئەحمەد ئاماژە بۆ ڕەدی ئەمە دەکات، ئەگەرنا (قیاس أولی) هەیە، بەڵام وەك دەگوترێت: وەك مردارەوە بوو وایە لە ناچاریدا پەنای بۆ دەبردرێت[(٢)].

---

(١). (شرح أصول السنة)(٦٤-٦٦).
(٢). (شرح أصول السنة)(١٩-٢٠).



## هەرکەسێك باوەڕی بە یەکێك لەم

## بنەمایانە نەبێت لە ئەهلی سوننەت نییە

(ومن السُّنَّةِ اللَّازِمةِ الَّتِي مَنْ تَرَكَ مِنْهَا خَصْلَةً لم يَقْبَلْهَا ويُؤْمِنْ بِهَا لَم يَكُنْ مِنْ أَهْلِهَا: الإيمَانُ بِالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّه، والتَّصْدِيقُ بالأَحَادِيث فِيه، وَالإِيمَانُ بِهَا لا يُقَالُ:لِمَ؟، وَلاكَيْفَ؟، إنَّمَا هُوَ التَّصْدِيقُ بِهَا وَالإيمَانُ بِهَا.

ومَنْ لَمْ يَعْرِفْ تَفْسِيْرَ الحَدِيث ولم يَبلُغْهُ عَقْلُهُ فَقَد كُفِيَ ذَلِكَ وأُحْكِمَ لَهُ، فَعلَيْهِ الإِيمَانُ بِهِ، وَالتَّسْلِيمُ لَهُ).

واتە: ئەو ڕێباز و مەنهەجەی کە پێویستە، ئەگەر کەسێك خەسڵەتێکی واز لێ بهێنێت و دانی پێدانەنێت و باوەڕی پێی نەبێت لە ئەهلی ئەو ڕێباز و مەنهەجە نییە، بریتییە لە:

باوەڕ هێنان بە قەدەری خێر و شەڕ، و بە ڕاستزانینی ئەو فەرموودانەی لەوبارەیەوە هاتووە، و باوەڕ هێنان بەوەی تێیدایە و ناگوترێت: بۆچی؟ و چۆن؟ بەڵکو دەبێت بە ڕاستی بزانێت و باوەڕی پێ هەبێت.

**و هەرکەسێك تەفسیری فەرمووده نەزانێت و بە عەقڵی تێینەگات، زانا هەیە بۆی ڕوون دەکاتەوە و لێکدانەوەی ئەوانی بەسە، پێویستە لەسەری باوەڕی پێی هەبێت، و تەسلیم و ملکەچ بێت و ڕەتی نەکاتەوە.**

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: (**ومن السّنة**) مانای ڕێباز و مەنهەجە، و بزانن سوننە دەبێتە دوو بە شەوە یان مەبەست دوو شتە:

بەشی یەکەم: مەبەست لە سوننەت ئەو ڕێگا و مەنهەجەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی لەسەری بوون، ئەم بەشە واجب و سوننەتیش دەگرێتەوە، دەگوترێت: فڵان شت لە سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەگەر ئەو قسەیە کرا هێشتنەوەی ڕیش و کورتکردنەوەی پۆشاك بۆ سەرووی قولە پێکانە دەگرێتەوە کە واجبن، هەروەها سوننەتیش دەگرێتەوە، وەك بەخشینی شت بە دەستی ڕاست، و وەرگرتن بە دەستی ڕاست.

بەشی دووەم: سوننەت لای فەقیهەکان جیاوازە لە واجب وەك فەزڵەکان و جگەوەش، وەك ئەو فەموودەیەی دەفەرموێت: ((كانَ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ، في تَنَعُّلِهِ، وتَرَجُّلِهِ، وطُهُورِهِ، وفي شَأْنِهِ كُلِّهِ))[١].

(١). أخرجه البخاري ومسلم.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لای ڕاستی پێ خۆش بوو، بۆ لە پێکردنی پێڵاو و شانەکردنی قژی و دەستنوێژ و لە هەموو کاروبارێکیدا.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەگوترێت: سوننەتە بە ڕاست دەست پێ بکرێت.

بەڵام واجب لە بەشی یەکەمە وەك نانخواردن بە دەستی ڕاست و هێشتنەوەی ڕیش و کورتکردنەوە سمێڵ و هاوشێوەی ئەوانە.

قەدەر بریتییە لەوەی خوا دیاری کردووە بۆ بەندەکان لە خێر و شەڕ و باوەڕ و کوفر، خۆشحاڵی و بەدحاڵی، و دەوڵەمەندی و هەژاری، و هەموو شتەکانی تر کە خوا ﷻ دیاری کردووە، ئەو فەرموودە صەحیحە بەڵگەیە لەسەری کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((أَوَّلُ ما خلَق اللهُ القَلمَ، فقال لهُ: اكتُبْ، فَجَرى فِي تِلكَ السَّاعة بَما هو كائِن إلى يومِ القيامةِ))[1].

(١). أخرجه الترمذي و صحه الألباني.

واتە: یەکەم شتێك کە خوا دروستی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو: بنووسە، لەو کاتەدا هەموو ئەوەی ڕوودەدات هەتاکو ڕۆژی قیامەت نووسی.

دیسان لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ((كَتَبَ اللَّهُ مَقَادر كُلِ شيء، قَبْلَ أَن يَخلَقَ قبلَ أن يخلقَ السَّمواتِ والأرضَ بخمسينَ ألفَ سنةٍ، وَكانَ عرشُهُ على الماءِ))[1].

واتە: خوا ﷻ قەدەری هەموو شتێکی نوسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات بە پەنجا هەزار ساڵ، و عەرشی لەسەر ئاو بوو.

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: ((أَنَّ الصحابة قالوا: يا رسولَ اللهِ، أرأيت مَا نَعملُ فيه أمر مستأنَفٍ أو أمرٍ قد فُرِغَ منهُ؟ قالَ النبي ﷺ: بل، أمر قد فُرِغَ منهُ، قالَ الصحابة: أفلا نترك العمل ونتكل على كتابنا؟ قالَ: اعمَلوا، فَكلٌّ ميسَّرٌ لما خُلِقَ لَه))[2].

---

(١). أخرجه مسلم.
(٢). أخرجه مسلم.

واتە: هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو کردارانەی ئەنجامی دەدەین لە قەدەردا نەنوسراوە یان هەموو نوسراوە لێبووەتەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵکو هەموو نوسراوە و لیٚ بووەتەوە، هاوەڵان گوتیان: کەوابوو بۆ واز لە کردار کردن نەهێنین و پشت بە کتێبەکەمان ببەستین؟ فەرمووی: کردەوە بکەن، هەموو کەسێك ئەوەی بۆی دروستکراوە بۆی ئاسان دەکرێت.

باوەڕ بە قەدەر پێویستە و دەبێت تەسلیم و ملکەچ بیت، ئەو کەسەی باوەڕی بە قەدەر نەبێت هیچ بەشێکی لە ئیسلامدا نییە، لەبەر ئەوە لە فەرموودەی عبداللەی کوڕی عومەردا رضي الله عنهما هاتووە لە یەحیای کوڕی یەعمورەوە دەڵێت: (كان أَوَّل مَن قال في القَدَرِ بالبصرةِ مَعْبَدٌ الجُهَنيُّ، فانطَلَقْت أنا وحُمَيدُ بنُ عبدِ الرَّحمنِ الحميري، حاجين أو معتمرين فقُلْنا: لو لَقِينا أحداً من أصحابِ رسولِ اللهِ ﷺ، فسَأَلْناهُ عمّا يقولُ هؤلاءِ القَومُ في القَدَرِ، فَوُفق لنا عبدَ اللهِ بنَ عُمرَ داخلا المسجدِ، فاكتَنَفْتُه أنا وصاحبي: أحَدُنا عن يَمينِه، والآخَرُ عن شِمالِه، فظَنَنْتُ أنّ صاحِبي يَكِلُ الكلامَ إليَّ، فقُلْتُ: يا أبا عبدِ الرَّحمنِ، إنّه ظَهَرَ قِبَلَنا ناسٌ يَقرَؤون القُرآنَ، ويَتقفرون العِلْمَ، وذكر من شأنهم، يَزعُمون أنْ لا قَدَرَ، إنّما الأَمرُ أُنُفٌ! قال

عبدُ اللهِ: فإذا لَقِيتُم أولئكَ فأَخبِروهُم أنِّي بريءٌ منهُم، وأنّهُم مِنِّي بُراءُ، والَّذي يَحلِفُ به عبدُ اللهِ بنُ عُمرَ، لو أنّ لأحدِهِم مِثْلَ أُحُدٍ ذهَبًا، فأَنفقَه، ما قَبِلَه اللهُ ﷻ منه حتّى يؤْمِنَ بالقَدَرِ... ثم ذكر حديث عمر بن الخطاب ومجيء جبريل إلى النبي ﷺ).

واتە: یەکەم کەس دەربارەی قەدەر قسەی کرد لە بەسرە مەعبەدی جوهەنی بوو من و حەمیدی کوڕی عبدالرحمانی حمیەری ڕۆیشتین بۆ حەج یان عومرە گوتمان: بریا بگەین بە یەك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵکو پرسیاری ئەو قسەیەی لێی بکەین کە ئەو کەسانە دەیکەن دەربارەی قەدەر، عبداللەی کوڕی عومەرەمان بینی لە مزگەوت، من هاوەڵەکەم ئەملاولامان لێگرت من لای ڕاست و هاوەڵەکەم لای چەپی، گومانم وابوو هاوەڵەکەم قسەکردن دەخاتە ئەستۆی من، گوتم: ئەی ئەبوعبدالرحمان کەسانێك لای ئێمە پەیدابوون قورئان دەخوێنن، و بەدوای زانستدا دەگەڕێن، و باسی حاڵیانم کرد، دەڵێن: قەدەر نییە، لە ڕابردوودا نەنووسراوە، عبدالله ﵁ گوتی: ئەگەر پێیان گەیشتن پێیان ڕابگەیەنن من لێیان بەریم، و ئەوان لە من بەرین، و سوێند بەو کەسەی عبداللەی کوڕی عومەر سوێندی پێ دەخوات،



ئەگەر کەسێکیان هێندەی ئوحود زێڕ ببەخشێت، خوا لێی قەبوڵ ناکات هەتاکو باوەڕی بە قەدەر نەبێت...پاشان باسی فەرموودەی کرد کە عومەری کوڕی خەتاب کە باسی هاتنی جبریل دەکات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ؛ ئیبن عومەر رضي الله عنهما تەبەرای کرد لەو کەسانەی دەڵێن: قەدەر نییە.

ئەم فەرموودانە جێگیرن پێویستە لەسەرمان باوەڕمان پێیان هەبێت، و ئەوەی تێیاندایە بە ڕاستی بزانین و گومانمان لێی نەبێت.

پاشان بزانن ئەوانەی گومڕابوون لە قەدەر دەبنە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: ئەوانەی نەفی قەدەر دەکەن، کە دەڵێن: قەدەر نییە و بانگەشەی ئەوە دەکەن بەندە خۆی کردەوەکانی خۆی دروست دەکات.

بەشی دووەم: ئەوانەی دان بە بوونی قەدەردا دەنێن و ڕۆچوون لە جێگیر کردنی بانگەشەئەوە دەکەن بەندە ناچارە لەسەر ئەنجامدانی کردەوەکانی، و هەردوو باسەکە بیدعە و پەڕگیرییە.

و حەق مامناوەندە کە بیروباوەڕی کۆمەڵی ڕزگار بووە کە دەڵێن:

باوەڕمان بە قەدەر هەیە و باوەڕمان وایە بەندە خۆی کردەوە ئەنجام دەدات و سەرپشکە، چونکە خوا ئەوەی بۆ جێگیر کردووە و دەفەرموێت: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ۝٢٨ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢٩﴾(التَّكْوِير).

واتە: کێ لە ئێوە بیەوێت ڕێگای ڕاست بگرێت، بەڵام ئێوە ناتوانن ڕێگای ڕاست بگرن هەتاکو خوای پەروەردگاری هەموو جیهان نەیەوێت؛ بەڵام ئەم سەرپشك کردنە لە قەدەری خوا ﷻ بەدەر نییە.

دیسان ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوە ئەو فەرموودەی خوایە ﷻ: ﴿وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلۡهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقۡوَىٰهَا ۝٨﴾(الشَّمْس).

واتە: سوێند بە نەفس و ئەوەی خودا کامڵی کردووە، خودا ئیلهامی تاوانکاری و پارێزگاری و لە خودا ترسانی پێبەخشیووە.

هاوشێوەی ئەو ئایەتانە، ئەگەر ئەمانەمان زانی دەزانین ئەو دوو کۆمەڵە پەڕگیرە گومڕان، کە ئەوانیش قەدەرییە نەفیکارەکانن، و

قەدەرییە جەبەرییەکانن[١]؛ و زەید مەدخەلی دەڵێت: پلەکانی قەدەر کە بە گەڕان و خوێندنەوە زانراوە بریتییە لە:

یەکەم: پلەی زانست، و خوا هەموو شتێکی دروست کردووە بە توانای و زانستی بە هەموو شتێك هەیە، و قەڵەم نوسیویەتی وەك ئەوەی فەرمانی پێکردووە، بەبێ کەم و زیاد، و پاش و پێش؛ دووەم: نوسینی لە لەوح المحفوز.

سێیەم: ویست و ئیرادەی کەونی، ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەری کە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ ١٢٥﴾(الأنعام).

واتە: هەرکەسێك خوا بیەوێت هیدایەتی بدات سنگ فراوان و دڵ گوشادی دەکات بۆ وەرگرتنی ئیسلام، و هەر کەسێك بیەوێت گومڕای

(١). (شرح أصول السنة)(٧١.٦٧).

بكات سنگی تەسك و نەفەس تەنگی دەكات و هیچ جێگای هیدایەتی تێدا نابێتەوە وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان سەركەوێت[1].

و ئەو ئایەتەی كە دەفەرموێت: ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٣٩﴾(الأَنعَام).

واتە: خوا كێی بوێت گومڕای دەكات و كێی بوێت هیدایەتی دەدات بۆ ڕێگای ڕاست.

چوارەم: دروستكردن، واتە: خوا هەموو شتێكی دروست كردووە بە ئەندازە، وەك خوا ﷻ دەڵێت: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ٤٩﴾(القَمَر).

---

(١). ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە هەركەسێك خودا هیدایەتی بدات ئەوە فەزڵی خودایە بەسەرییەوە، و هەركەسێك خودا گومڕای بكات بە هۆی ئەوەیە كە شایانی هیدایەت نییە، خودا ستەم لە كەس ناكات، چونكە خودا مرۆڤی سەرپشك كردووە بە ویستی خۆی كوفر و گومڕایی هەڵبژاردووە، و دڵی باوەڕدار فراوانە و گوێ دەگرێت بۆ هیدایەت و فەرمانەكانی خودا و جێگای یەكخوداپەرستی تێدا دەبێتەوە، بەڵام ئەو كەسانەی بێباوەڕ ودووڕوون كە باسی ئاینی خودایان بۆ بكرێت قەڵس و هەناسە سواردەبن و پشت هەڵدەكەن و لای لێناكەنەوە.

واتە: بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە قەدەر دروست کردووە[١].

ئەگەر کەسێك بڵێت ئایا مرۆڤ بەڵگە و بیانوی هەیە ئەگەر خوا گومڕای کرد و هیدایەتی کەسانی تریدا؟ نەخێر، چونکە هیدایەت فەزڵی خوایە ﷻ، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: فەزڵی خوا بە هەرکەسێکی دەبەخشێت کە بیەوێت، هەروەها گومڕا کردن پێویستە لەسەر حاڵی بەندە، لەبەر ئەو فەرموودەی خوا کە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ ٥﴾(الصَّفّ)، ئەوەی کە دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ٤٩﴾(المَائِدَة)، کەواتە خوا کێی بوێت گومڕای دەکات و کێی بوێت هیدایەتی دەدات لەبەر داناییەك، وبێگومان گومڕاکردن لەبەر کردەوەی بەندەیە[٢].

(١). (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)(٦٦.٦٥).
(٢). بڕوانە: (تفسير سورة الحديد-الحجرات)(٤١١).

## چۆنییەتی دروست بوونی مرۆڤ و دیاریکردنی قەدەری

**(مِثلَ حَدِيثِ: الصَّادِقِ المَصْدُوقِ، ومَا كَانَ مِثْلَه في القَدَرِ، وَمِثْلَ أحاديث الرُّؤيةِ كُلِّهَا وإن نَبَتْ عَنِ الأسْمَاعِ واسْتَوحَشَ مِنْهَا المُستَمِعُ).**

**واتە: وەك فەرموودەی (صادق المصدوق)، و ئەوەی هاوشێوەیەتی سەبارەت بە قەدەر، و فەرموودەکانی بینینی خوا ﷻ هەموویان دەبێت باوەڕمان پێی هەبێت و تەسلیمی بین، ئەگەر نامۆ و سەرسوڕهێنەریش بێت کاتێك دەبیسترێت.**

فەرموودەی (صادق المصدوق) مەبەست ئەم فەرموودەیە کە بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کە ڕاستگۆی پشتڕاستکراوەیە بۆی باسکردین: ((إنَّ العَبدَ يجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أرْبَعِينَ يَوْمًا نطفة، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُرسلُ إليه الملَكُ فيَنفخُ فيه الرُّوحَ فيُكتبُ رزقَه وعمله وأجلُه وشقي أو سعيد)).

واتە: بەندە سەرەتای دروست بوونی لە سکی دایکیدا چل ڕۆژ



دلۆپێك ئاوە، پاشان چل ڕۆژ خوێنێکە خۆی هەڵواسیوە بە منداڵدانی دایکییەوە، پاشان چل ڕۆژ دەبێتە پارووپەك گۆشت، پاشان فریشتەی بۆ دەنێردرێت ڕۆحی بە بەردا دەكات، و ڕۆزی و کردار وتەمەن و بەدحاڵی و خۆشحاڵی دەنوسێت.

و قەدەر لە لەوح المحفوزدا نوسراوە، ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی لە عوبادەی کوڕِ صامتەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَوَّلُ ما خلَق اللهُ القَلمَ، فقال لهُ: اكتُبْ، فَجَرى فِي تِلكَ السَّاعة بَما هو كائِن إلى يومِ القيامةِ)).

واتە: یەکەم شتێك کە خوا دروستی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو: بنووسە، لەو کاتەدا هەموو ئەوەی ڕوودەدات هەتاکو ڕۆژی قیامەت نووسی.

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: فریشتە بەڕێزەکان کە کردەوەکانی بەندەکان دەنوسن لەگەڵیدا هەموو شتێك دەنوسن پاشان بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان، دەڕواننە لەوح المحفوز دەبینن ئەوەی نوسیویانە هاوتایە

لەگەڵ ئەوەی لەسەر بەندە نوسراوە، و ئەو نوسراوانە پیشان خوا ﷻ دەدرێت ڕۆژی دوو شەممە و پێنج شەممە، خوا ﷻ ئەوەی ویستی لەسەر بێت دەیسڕێتەوە ئەوەی کە پاداشت و سزای لەسەر نییە، وەك ئەم قسانە: باری سوارییەکە دابگرە، پەرداخم بۆ بهێنە، و ئاوم بۆ بهێنە بیخۆمەوە، و هاوشێوەی ئەوانە، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴿٣٩﴾﴾(الرَّعْد).

واتە: ئەوەی فریشتەکان لە کردار و گوفتاری بەندەکان تۆماری دەکەن، خوا دەیسڕێتەوە ئەوەی ویستی لەسەربێت، وجێگیری دەکات ودەیهێڵێتەوە ئەوەی ویستی لەسەربێت، وخوا لوح المحفوزی لایە، هەموو ئەوەی ڕوودەدات هەتاکو ڕۆژی قیامەت تیایدا نوسیویەتی و گۆڕانی بەسەردا نایەت.

ئەمە پێی دەگوترێت قەدەری ئەزەلی، پاشان قەدەری تەمەنمان هەیە کە لە فەرموودەکەی ئیبن مەسعودا ﷺ باسکرا، دوای ئەوە قەدەری ساڵانەیە، کە لە شەوی قەدردا دیاری دەکرێت، و فەرمان بە فریشتە دەکرێت هەموو ئەوەی لەو ساڵەدا بەسەر بەندەکان دێت

بینوسن، کە بە جێبەجێ کردنی قەدەری ئەزەلی دادەنرێت، پاشان تەقدیری ڕۆژانەیە، ئەو کردەوانەیە بەندەکان ڕۆژانە ئەنجامی دەدەن و فریشتەکان دەینوسنەوە، ئەمەش دیسان بە جێبەجێ کردنی قەدەری ئەزەلی دادەنرێت.

کەواتە قەدەر دابەش دەبێت بۆ چوار بەش:

یەکەم: قەدەری ئەزەلی، لە فەرموودەکەی قەڵەمدا باسکرا.

دووەم: قەدەری تەمەن، لە فەرموودەکەی ئیبن مەسعودا رضي الله عنه باسکرا.

سێیەم: قەدەری ساڵانە، کە لە شەوی قەدردا ئەوەی لە ساڵێکدا ڕوودەدا تۆمار دەکرێت.

چوارەم: قەدەری ڕۆژانە، بریتییە لەوەی فریشتەکان ڕۆژانە لە تۆمارەکانیان تۆماری دەکەن.

سێ بەشەکەی کۆتای لە بەشی یەکەمەوە وەرگیراوە، و باوەڕی بەندە تەواو نابێت هەتاکو باوەڕی بە هەموو ئەوانە نەبێت و گومانی لێی

نەبێت، و پێغەمبەری خوا ﷺ لەو باسەی کە جبریل هاتووە بۆ لای فەرموویەتی: ((وتؤمنَ بالقدرِ خيرِه وشرِّه))[١].

واتە: باوەڕت بە قەدەر هەبێت خێر و شەڕی[٢].

سەعدی دەڵێت: گۆڕین لە بەشەکاندا ڕوودەدات، وەك کردارەکانی ڕۆژ و شەو کە فریشتەکان دەینوسن، و خوا بۆ جێگیر کردن و سڕینەوەی هۆکاری داناوە، و ئەو هۆکارانە پێچەوانەی ئەوە نابن کە لە لوح المحفوزدا نوسراوە و تۆمار کراوە، وەك چۆن خوا چاکەکاری و گەیاندنی سیلەی ڕەحمی کردووەتە هۆکاری تەمەن درێژی و فراوانی ڕۆزی، هەروەها تاوان و خراپەکاری کردووەتە هۆکاری لە ناوبردنی بەرەکەتی ڕۆزی وتەمەن[٣]؛ و ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ﴾ ڕاڤەکاران ناکۆکن لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتە، سەوری و وەکیع و هوشەیم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت:

(١). أخرجه مسلم.
(٢). (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)(٦٥ـ٦٦).
(٣). (تيسير الكريم الرحمن)(٤١٩/١).

خوای پەروەردگار کاروفەرمانی بەندەکانی بۆ ساڵێك دیاری دەکات، پاشان ئەوەی بیەوێت دەیسڕێتەوە، جگە لەوەی کە لە خراپەکاری و چاکەکاری و ژیان و مردن کە لەسەری نوسراوە، و لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: هەموو شتێك کە خوا بیەوێت دەیسڕێتەوە یان جێگیری دەکات و دەیهێڵێتەوە، جگە لەوەی کە لە خراپەکاری و چاکەکاری و ژیان و مردن کە لەسەری نوسراوە، چونکە ئەو شتانە کۆتایی پێهاتووە، و تەبەری لە ئەبو عوسمانی نەهدییەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه تەوافی کەعبەی دەکرد و دەگریا و دەیگوت: پەروەردگارا ئەگەر خراپەکاری یان تاوانت لەسەرم نوسیوە بیسڕەوە، و چونکە دڵنیام تۆ ئەوەی ویستت لەسەر هەبێت دەیسڕیتەوە، و ئەوەشی ویستت لەسەری هەبێت جێگیری دەکەیت، و لوح المحفوزدا لای خۆتە خوایە لە خۆشحاڵەکانبم وتاوانەکانم بپۆشە ولیێم خۆشبە[1].

---

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٤/٤٦٨-٤٦٩).



## قەدەر نهێنی خودایە و مشتومڕی تێدا ناکرێت

(فَإِنَّمَا عَلَيْهِ الْإِيمَان بهَا وَأَن لَا يرد مِنْهَا حرفا وَاحِد، وَغَيرهَا من الْأَحَادِيث المأثورات عَن الثِّقَات.

وَأَن لَا يُخَاصم أحداً وَلَا يناظره وَلَا يتَعَلَّم الْجِدَال، فَإِن الْكَلَام فِي الْقدر والرؤية وَالْقُرْآن وَغَيرهَا من السّنَن مَكْرُوه ومنهي عَنهُ، لَا يكون صَاحبه وَإِن أصَاب بِكَلَامِهِ السّنة من أهل السّنة حَتَّى يدع الْجِدَال ويؤمن بالآثار).

واتە: پێویستە لەسەری باوەڕی پێی هەبێت، و یەك پیتی لیّ ڕەت نەکاتەوە، هەروەها فەرموودەکانی تر کە ڕیوایەت کراون لە کەسانی باوەڕ پێکراوەوە.

و مشتومڕ و چەندوچوون نەکات لەگەڵ کەسدا و فێری مشتومڕ نەبێت، چونکە قسە کردن سەبارەت بە قەدەر و بینینی خوا ﷻ و قورئان و جگە لەوانەش لە سوننەتەکان مەکروهە و نەهی لێکراوە، ئەو کەسەی مشتومڕ دەکات ئەگەر قسەکانی تەبابێت لەگەڵ سوننەتدا و حەقیش بپێکێت نابێتە ئەهلی سوننەت، هەتاکو واز لە مشتومڕ نەهێنێت و باوەڕی بە ئاسارەکان نەبێت.

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: (**لَا يرد مِنْهَا حرفا وَاحِد**) واتە: ئەو فەرموودانەی باسکرا سەبارەت بە قەدەر و ئەوانی تریش، نەهیکراوە لە مشتومڕ سەبارەت بە قەدەر، چونکە قەدەر نهێنییەکە لەو نهێنیانەی کە خوا زانستی تایبەت کردووە بە خۆیەوە و کەس نایزانێت، دروست نییە بۆمان ڕەخنە بگرین و بەرهەڵستی بکەین و مشتومڕ بکەین لەو پرسانە، چونکە مشتومڕ لەو پرسانە ناگاتە دەرئەنجامێك، بەڵکو لەوانەیە دەرئەنجامەکەی دروست بوونی گومان بێت بۆ بەندە، پێویستە بزانیت ئەوەی واجبە لەسەرت ئەی بەندە وازهێنانە لە مشتومڕ و چەندوچوون کردن سەبارەت بە پرسی قەدەر، ئەوە لە بەرژەوەندی تۆیە، چونکە ئەو شوبهانەی کەسی موبتەدع دەوروژێنن گوێیان بۆ بگریت لەوانەیە بچێتە دڵتەوە و جێگیر بێت تێیدا و گومانت بۆ دروست ببێت، دوای ئەوەی کە دڵنیا بوویت و باوەڕدار بوویت، بۆیە لەبەر خوا وریای نەفسی خۆتبە و دوورکەوەرەوە لەو پرسانە، چونکە شوێنی خلیسکان و تیاچوونە بۆ ئەو کەسەی تێدەکەوێت.

و لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ لای هاوەڵەکانی مشتومڕیان دەکرد دەربارەی قورئان، زۆر توڕە بوو، وەك ئەوەی هەنار بە ڕوخساریدا کرابێت، و فەرمووی: ((أَبِهَذا أُمِرتُمْ))[١].

واتە: ئایا بەمە فەرمانتان پێکراوە[٢].

(١). أخرجه الترمذی وحسنه الألباني.
(٢). (شرح أصول السنة)(٧٥).

## قورئان فەرموودەی خودایە و دروستکراو نییە

(وَالْقُرْآن كَلَام الله وَلَيْسَ بمخلوق، وَلَا تَضْعف أَن تَقول لَيس بمخلوق، فَإِن كَلَام الله صفة من صفاته لَيْسَ بِبائن مِنْهُ وَلَيْسَ شَيْء من صيفاته مخلوق، وَإِيَّاك ومناظرة من أحدث فِيهِ وَمن قَالَ بِاللَّفْظِ وَغَيره، وَمن وقف فِيهِ فَقَالَ: لَا أَدْرِي مَخْلُوق أَو لَيْسَ بمخلوق؟ وَإِنَّمَا هُوَ كَلَام الله، فَهَذَا صَاحب بِدعَة مثل من قَالَ: هُوَ مَخْلُوق، وَإِنَّمَا هُوَ كَلَام الله لَيْسَ بمخلوق).

واتە: قورئان فەرموودەی خوایە و دروستکراو نییە، لاواز مەبە بڵێت: دروستکراو نییە، چونکە فەرموودەی خوا سیفەتێکە لە سیفەتەکانی، و لێی جیا نییە، و هیچ شتێك لە سیفاتەکانی دروستکراو نییە، وریابە مشتومڕ لەگەڵ ئەو کەسەدا مەکە کە داهێنانی کردووە و دەڵێت: لەفزم بە قورئان مەخلوقە، و جگە لەوەش، و هەرکەسێك بوەستێت و بڵێت: نازانم دروستکراوە یان دروستکراو نییە، بەڵام بێگومان فەرموودەی خوایە، ئەمە خاوەن بیدعەیە وەك ئەو کەسەی دەڵێت: قورئان دروستکراوە، بەڵکو بێگومان قورئان فەرموودەی خوایە و دروستکراو نییە.

خوا ﷻ ناوی قورئانی بە فەرموودەی خۆی هێناوە و دەفەرمویێت:

﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ٦﴾(التَّوْبَة).

واتە: ئەگەر کەسێك لە هاوبەش بڕیاردەران داوای پەنادان ودالْدەدانی لێ کردیت، پەنای بدە، هەتاکو فەرموودەی خوا دەبیستێت.

سەعدی دەڵێت: ﴿يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ ئەمە بەڵگەیەکی ڕاشکاوە بۆ مەزهەبی ئەهلی سوننەت وجەماعەت، کە دەڵێن: قورئان فەرموودەی خوایە و دروستکراو نییە، چونکە خوا فەرموویەتی، وقسەکردنی داوەتە پاڵ خۆی، وبەڵگەشە لەسەر پووچەڵی مەزهەبی موعتەزیلە وهاوبۆچوونەکانیان کە دەڵێن: قورئان دروستکراوە[1].

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: عومەر ﷺ دەڵێت: قورئان فەرموودەی خوایە، بە بۆچوونەکانی خۆتان لێکدانەوەی بۆ مەکەن.

(١). (تيسير الكريم الرحمن)(٣٢٩/١).



و مالك دەڵێت: قورئان فەرموودەی خوایە ﷻ، و ئەو کەسەی دەڵێت: قورئان دروستکراوە قسەیەکی زۆر خراپی کردووە، سزا دەدرێت و لێی دەدرێت و بەند دەکرێت هەتاکو دەمرێت.

و شافعی دەڵێت: قورئان فەرموودەی خوایە و دروستکراو نییە و هەرکەسێك بڵێت: دروستکراوە کافرە.

هەروەها ئیمام ئەحمەد بەندکرا و لێیدرا هەتاکو بێهۆش بوو و پێی دەگوترا: بڵێ: قورئان دروستکراوە، ڕەتی دەکردەوە، و دەیگوت: چون شتێك بڵێم: پێچەوانەی ئەوەی خوا ﷻ فەرموویەتی، و پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرموویەتی، بەوەش خوا بە هۆیەوە پاڵپشتی سوننەتی کرد و حەقی سەرخست و بەڵگەی ڕوونکردەوە کاتێك نزیك بوو لەناوبچێت، بە ڕاستی ئیمامی سوننەتە، هەندێك لە سەلەف دەڵێن: خوا ئیسلامی سەرخستنی لە سەردەمی هەڵگەڕاوەکان بە هۆی ئەبوبەکرەوە، و بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە سەردەمی فیتنەی ئەوەی دەیانگوت: قورئان دروستکراوە، خوزگە بە خۆی چی پێشەوایەکە، و خوا ڕەحمی پێ بکات ڕەحمی چاکەکاران، و ڕەحم بە سەلەف بکات کە دامەزراو

بوون لەسەر حەق و تێکۆشان بۆ ڕوون کردنەوەی و ئێمەش بەوان بگەیەنێت، و لە ڕیزی ئەوانمان بژمێرێت، لەگەڵ ئەو کەمتەرخەمیانەی کە هەمانە.

و موبتەدیعەکان لەم پرسەدا دەبنە سێ بەشەوە:

١. کەسانێکیان گوتیان: قورئان دروستکراوە وەك موعتەزیلەکان، و ئەوەی چووەتە ڕیزیانەوە و شوێنیان کەوتووە لەم بیدعە زۆر خراپە.

٢. کەسانێکی تریان گوتیان: لەفزی ئێمە بە قورئان دروستکراوە، ئەو کەسانە سەلەف حوکمیانداوە بەسەریاندا بەوەی موبتەدعن، و حوکمیانداوە بەسەر ئەوانەی دەڵێن: قورئان دروستکراوە بەوەی کافرن.

یەکەم کەس کە باسی ئەم پرسەی باسی کردووە و کتێبی لەسەر نوسیوە بوخارییە کە کتێبی (خلق أفعال العباد)ی نوسیوە، ئەوە باش بزانن و ئەو پرسەتان تێکەڵ نەبێت لاتان...

و ئیمام ئەحمەد نکوڵی کرد لە عەلی کوڕی حەسەنی کەرابیسی کاتێك گوتی: لەفزم بە قورئان دروستکراوە، نکوڵی کردنەکەی لەبەر ڕەهای

قسەکەی بوو، چونکە ئەم مانا و ئەو ماناش هەڵدەگرێت، ئەگەر ئەو لێبگەڕێت و نکوڵی نەکەیت موبتەدعەکان وەك فێڵ و تەڵەکەیەك بە کاری دەهێنن، بەوەش ئیمام ئەحمەد پرسەکەی بڕیەوە و ڕێگری کرد ئەو قسەیە بکرێت، و ئێمە کاتێك باسی ئەمە دەکەین بۆ زانستە، دروست نییە بۆ کەس ئەم قسەیە بەکاربهێنێت، بڵێت: لەفزم بە قورئان دروستکراوە، و هەرکەسێك بەکاری بهێنێت موبتەدعە، و پێویستە لەسەری تەوبە بکات بۆ لای خوا ﷻ بگەڕێتەوە[(١)].

تەحاوی دەڵێت: بێگومان قورئان فەرموودەی خوایە، لە خواوە ﷻ دەستی پێ کردووە و بە فەرموودە فەرموویەتی بەبێ چۆنییەتی، بە وەحی دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکەی ﷺ، باوەڕداران لەسەر ئەوە بە ڕاستگۆیان داناوە بە حەق، دڵنیان کە قورئان فەرموودەی خوایە ﷻ بە حەقیقەت و دروستکراو نییە وەك قسەی خەڵك، هەرکەسێك بیبیستێ بڵێت: قسەی مرۆڤە کافر دەبێت، خوا زەم و عەیبداری کردووە و هەڕەشەی بە سەقەر لێ کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾﴾(المُدَّثِّر)، واتە: دەیخەمە

(١). (شرح أصول السنة)(٧٦-٧٩).

دۆزەخەوە و بە ئاگری دۆزەخ دەیسوتێنم، کاتێك خوا ﷻ هەڕەشەی بە سەقەر کرد بۆ ئەو کەسەی کە دەڵێت: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ۝٢٥﴾(المُدَّثِّر)، واتە: بێگومان ئەمە قسەی مرۆڤە و فەرموودەی خوا نییە، دەزانین و دڵنیاین قورئان فەرموودەی دروستکاری مرۆڤە و قسەی مرۆڤ لە فەرموودەی خوا ناچێت[1].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ۝٧٥﴾(البَقَرَة).

واتە: ئایا ئێوە ئومێدەوارن و بە تەمای ئەوەن جوولەکە باوەڕ بە ئایینەکەی ئێوە بهێنن، لە کاتێکدا کۆمەڵێك لەوان فەرموودەی خوایان دەبیست و بە هەڵە لێکیان دەدایەوە و ماناکەیان تێکدەدا، لە کاتێکدا بە باشی لێی تێدەگەیشتن وبە زانینەوە ئەو چەواشەکارییەیان دەکرد.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾(الفَتْح).

واتە: دەیانەوێت فەرموودەی خوا بگۆڕن.

(١). (العقيدة الطحاوية)(٤٠).

ئەلبانی دەڵێت: شێخ محمد بن مانع: لە (ل٨)دا دەڵێت: قورئانی مەزن فەرموودەی خوایە ﷻ لەفز و مانای و ناگوترێت لەفزی خوایە جگە لە ماناکەی، کە ئەوە قسەی ئەهلی ئیعتزالە و ناگوترێت مانای هی خوایە جگە لە لەفزەکەی کە ئەوە قسەی کولابییە گومڕاکانە، هەرکەسێك شوێنیان کەتووە لەو باتڵەیان لە ئەهلی کەلامی، ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕیان وایە و دەڵێن: قورئان فەرموودەی خوایە و دابەزێنراوە و دروستکراو نییە، لەفز و ماناکانی خودی فەرموودەی خوایە، جبریل عليه السلام لە خوای ﷻ بیستووە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە جبریلی عليه السلام بیستووە، هاوەڵان لە پێغەمبەری خوایان ﷺ بیستووە، لە موصحەفەکاندا نوسراوەتەوە، لە دڵەکاندا لەبەرکراوە و بە زمانەکان دەخوێندرێتەوە.

و ئیبن قەیم دەڵێت: قورئان خودی فەرموودەی خوایە، لێیەوە بیستراوە بە حەقیقەت و ڕوونی، قورئان هەمووی فەرموودەی پەروەردگارمە نەوەك هەندێکی، لەفز و مانای لە خواوەیە و دروستکراو نییە، دابەزێنراوی پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکانە و وەحییە، لەفز و مانای لە خواوەیە بەبێ فێڵ و پێچ و پەنا[1].

---

((١)). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٢٤-٢٨).

## باوەڕداران لە قیامەتدا خوا ﷻ دەبینن

**(وَالْإِيمَان بِالرُّؤْيَةِ يَوْم الْقِيَامَة كَمَا رُوِيَ عَن النَّبِي صلى الله عَلَيْهِ وَسلم من الْأَحَادِيث الصِّحَاح).**

**واتە: باوەڕ بە بینینی خوا ﷻ لە قیامەتدا واجبە وەك چۆن ڕیوایەتكراوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە فەرموودە صەحیحەكاندا.**

بەڵگە لەسەر بینینی خودا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا زۆرە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ ٢٦﴾(يُونُس).

واتە: بۆ ئەوانەی كە چاكەكارن پاداشتی چاكە هەیە كە نازونیعمەتی بەهەشتە، و زیاتر لەوەش پاداشتیان بۆ چەندجارە دەكرێت، لە هەموو ئەوانەش باشتر بینینی پەروەردگارە.

مسلم لە صوهەیبی كوڕی سینانی ڕۆمییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إذا دَخَلَ أهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، قالَ: يَقُولُ اللَّهُ تَبارَكَ وتَعالَى: تُرِيدُونَ شَيْئًا أزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولونَ: ألَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنا؟ ألَمْ تُدْخِلْنا الجَنَّةَ،

وتُنَجِّنا مِنَ النّارِ؟ قالَ: فَيَكْشِفُ الحِجابَ، فَما أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلى رَبِّهِمْ ﷻ؛ ثُمَّ تَلا هَذِهِ الآيَةَ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ ﴿٢٦﴾﴾)).

واتە: ئەگەر بەهەشتییەکان چوونە بەهەشتەوە، خوا ﷻ پێیان دەفەرموێت: هیچ شتێکتان دەوێت بۆتانی زیاد بکەم؟ دەڵێن: ئایا ڕووت سپی نەکردووین؟ ئایا بەهەشتت پێ نەبەخشیوین؟ ئایا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت نەکردووین؟ دەفەرموێت: پەردە لادەدرێت، پەروەردگاریان دەبینن، هیچ شتێکیان پێ نەبەخشراوە پێیان خۆشتربێت لە ڕوانینیان بۆ پەروەردگاریان ﷻ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ﴾.

و خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾(القِيامَة).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کۆمەڵە ڕوخسارێك دەدرەوشێنەوە، و دەڕواننە پەروەردگاریان.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ٢٢ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ٢٣﴾(المُطَفِّفِين).

واتە: بێگومان چاکەکاران لە نازونیعمەت و خۆشگوزەرانیدان، لەسەر تەخت و ڕاخەر دەڕوانن.

ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا لە نازونیعمەتی نەبڕاوەدان، و فەزڵی خوا ﷻ داپیۆشیون، ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ﴾ لەسەر تەخت و ڕاخەرەکانیان کە سێبەری لەسەرە، ﴿يَنظُرُونَ﴾ گوتراوە: مانای ئەوەیە دەڕواننە موڵك و ئەو فەزڵ و خێرەی خوا پێی بەخشیون، کە لەناوناچێت و کۆتایی نایەت، و گوتراوە: مانای: ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ دەڕواننە خوایە ﷻ، و ئەمە لە بەرانبەر ئەوەیە کە خوا وەسفی خراپەکاری کرد و فەرمووی: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥﴾(المُطَفِّفِين)، باسی

ئەوانەی کرد دەڕواننە پەروەردگاریان لەسەر ڕاخەرە سێبەردارەکەیانەوە[١].

ڕەبیعی کوڕی سلیمان دەڵێت: ڕۆژێك لای شافعی بووم، نوسراوێکی لە صەعیدەوە ـ شوێنێکە لە وڵاتی میسر ـ بۆ هات، پرسیاریان لێکرد دەربارەی ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾﴾(المُطَفِّفِين)، شافعی: لە وەڵامیدا نوسی: کاتێك خوا لەبەر تووڕەیی کەسانێکی بێبەش کردن لە بینینی، بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەسانێك لەبەر ڕەزامەندی لێیان دەیبینن[٢].

و بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((قُلْنا: يا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرى رَبَّنا يَوْمَ القِيامَةِ؟ قالَ: هَلْ تُضارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ والقَمَرِ إذا كانَتْ صَحْوًا؟، قُلْنا: لاَ، قالَ: فَإنَّكُمْ لاَ تُضارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَئِذٍ، إلا كَما تُضارُونَ فِي رُؤْيَتِهِما)).

---

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٨/٣٥٢).
(٢). (تفسير الإمام الشافعي)(٣/١٤٢٩).



گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پەروەردگارمان لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینین؟ فەرمووی: ئایا کەس کێشە و پاڵەپەستۆتان لەسەر دادەنێت بۆ بینینی خۆر و مانگ ئەگەر ئاسمان ساماڵ بێت؟ گوتمان: نەخێر، فەرمووی بەوشێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا کەستان هیچ گرفت و پاڵەپەستۆیەکی لەسەر دروست نابێت بۆ بینینی پەروەردگاری.

ئەلبانی دەڵێت: فەرموودە دەربارەی سەلماندنی بینینی خوای پەروەردگار لە لایەن باوەڕدارانەوە زۆر زۆرە هەتاکو گەیشتووەتە ئاستی تەواتر، هەندێك لە پێشەواکان جەختیان لەوە کردووەتەوە، لەوانە ئیبن ئەبوالعزی کە شەرحی تەحاوی کردووە و هەندێك لەو فەرموودانەی هێناوە پاشان دەڵێت: ئەو فەرموودانەی باسی بینینی خوا ﷻ دەکەن نزیکەی سی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیوایەتیان کردووە، هەرکەسێك شارەزای هەبێت دەربارەیان دڵنیا دەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی،.... پاشان دەڵێت: چواندنی بینینی خوا ﷻ بە بینینی خۆر و مانگ چواندنی خوا ﷻ نییە، بەڵکو چواندنی بینینە بە بینین، بەڵام بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە خوا لە بەرزییە لە سەرووی دروستکراوەکانی، ئەگەرنا ناشێت بینین ڕووبدات بەبێ چاوپێکەوتن؟ هەرکەسێك بڵێت: دەبینرێت بەڵام لە ئاراستەیەکدا

نابینرێت، یا بە عەقڵ و ژیری خۆیدا بچێتەوە!! یان ئەوەیە لووتبەرزە و عەقڵی خۆی بەشت دەزانێت، یان لە عەقڵیدا شتێك هەیە، چونکە ئەگەر بڵێت: دەبینرێت نەلە پێشی ئەو کەسەی کە دەیبینێت و نەلە پشتی، و نەلە لای ڕاستی ونە لە لای چەپی، نەلە سەرەوەی ونە لە خوارەوەی، هەموو کەسێك کە فیترەتی سەلامەت بێت ئەوەی لێ ببیستێت ڕەدی دەداتەوە[1].

تەحاوی دەڵێت: بینینی خوا ﷻ حەقە بۆ ئەهلی بەهەشت لە قیامەتدا، بەبێ دەورەدان و چۆنییەتی، وەك لە کتێبەکەی پەروەردگارماندا فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾(القِيَامَة)، واتە: کۆمەڵە ڕوخسارێك لە ڕۆژی قیامەتدا جوانن و دەدرەوشێنەوە و دەڕواننە پەروەردگاریان، بەوشێوەیە تەفسیر دەکرێت کە خوا ﷻ ویستوویەتی و زانیویەتی و هەرچی لەوبارەیەوە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە بەوشێوەیەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی[2].

---

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٢٩-٣١).
(٢). (العقيدة الطحاوية)(٤٣).



## ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاوی خوای ﷻ بینیوە

**(وأَن النَّبِي ﷺ قد رأى ربه فَإِنَّهُ مأثور عَن رَسُول الله ﷺ صَحِيح، رَوَاهُ قَتَادَة عَن عِكْرِمَة عَن ابْن عَبَّاس، وَرَوَاهُ الحكم بن إبان عَن عِكْرِمَة عَن ابْن عَبَّاس، وَرَوَاهُ عَليّ بن زيد بن جدعان عَن يُوسُف بن مهْرَان عَن ابْن عَبَّاس، والْحَدِيث عندنَا على ظَاهره كَمَا جَاءَ عَن النَّبِي ﷺ وَالْكَلَام فِيهِ بِدعَة، وَلَكِن نؤمن بِهِ كَمَا جَاءَ على ظَاهره وَلَا نناظر فِيهِ أحدا).**

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردگاری بینیوە، ئەوە بە صەحیحی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەتکراوە، قەتادە لە عیکرمەوە لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە، و حەکەمی کوڕی ئیبان لە عیکرمەوە لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە، و عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جودعان لە یوسفی کوڕی مەهرانەوە لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە، و فەرموودەکە لای ئێمە لەسەر ڕەواڵەکەیەتی وەك چۆن لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە، و قسەکردن لە بارەیەوە بیدعەیە، بەڵام باوەڕمان پێی هەیە**

**وەك چۆن هاتووە لەسەر ڕەواڵەتی و مشتومڕ لەگەڵ کەس ناکەین لەسەر ئەو پرسە.**

شێخ ڕەبیع دەڵێت: ئەو دوو ئەسەرەی هێناویێتی هەردووکیان لاوازییان تێدایە: (**رَوَاهُ قَتَادَة عَن عِكْرِمَة عَن ابْن عَبَّاس، وَرَوَاه الحكم بن إبان عَن عِكْرِمَة عَن ابْن عَبَّاس، وَرَوَاهُ عَليّ بن زيد بن جدعان عَن يُوسُف بن مهْرَان عَن ابْن عَبَّاس**) حەکەمی کوڕی ئەبان (صدوق له أوهام) لە سەنەدی یەکەم، و سەنەدی دووەم عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جودعانی تێدایە زەعیفە، و یوسفی کوڕی مەهرانی تێدایە مەجهولە،کەس جگە لە عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جودعانەوە لێیەوە ڕیوایەتی نەکردووە، و ئەو دوو ئەسەرە مەوقوفن[(١)].

مسلم لە مەسروق لە عائیشەوە رضي الله عنها ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كُنْتُ مُتَّكِئًا عِنْدَ عائِشَةَ، فَقالَتْ: يا أبا عائِشَةَ، ثَلاثٌ مَن تَكَلَّمَ بِواحِدَةٍ مِنهُنَّ فَقَدْ أعْظَمَ عَلى اللهِ الفِرْيَةَ، قُلْتُ: ما هُنَّ؟ قالَتْ: مَن زَعَمَ أنَّ مُحَمَّدًا ﷺ رَأى رَبَّهُ فَقَدْ أعْظَمَ عَلى اللهِ الفِرْيَةَ،

(١). (شرح أصول السنة)(٤٩.٤٨).

قالَ: وكُنْتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ: يا أُمَّ المُؤْمِنِينَ، أَنْظِرِينِي، ولا تُعْجِلِينِي، أَلَمْ يَقُلِ اللّٰهُ عوزجل: ﴿ولَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ المُبِينِ﴿٢٣﴾﴾(التكوير)، ﴿ولَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرى﴿١٣﴾﴾(النجم)؟، فَقالَتْ: أنا أَوَّلُ هَذِهِ الأُمَّةِ سَألَ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ، فَقالَ: إنَّما هُوَ جِبْرِيلُ، لَمْ أَرَهُ عَلى صُورَتِهِ الَّتِي خُلِقَ عَلَيْها غَيْرَ هاتَيْنِ المَرَّتَيْنِ، رَأَيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنَ السَّماءِ سادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ ما بَيْنَ السَّماءِ إلى الأرْضِ، فَقالَتْ: أَوَ لَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللّٰهَ يَقُولُ: ﴿لا تُدْرِكُهُ الأَبْصارُ وهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصارَ وهُوَ اللَّطِيفُ الخَبِيرُ﴿١٠٣﴾﴾(الأنعام)، أَوَ لَمْ تَسْمَعْ أَنَّ اللّٰهَ يَقُولُ: ﴿وما كانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللّٰهُ إلّا وحْيًا أَوْ مِن وراءِ حِجابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإذْنِهِ ما يَشاءُ إنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴿٥١﴾﴾(الشورى)[١]...

واته: لای عائیشەی دایكی باوەڕداران رضي الله عنها شانم دابوویەوە، گوتی: باوكی عائیشە سێ شت هەیە هەركەسێك یەكێكیان بڵێت درۆی گەورەی بە ناوی خواوە كردووە، هەركەسێك بڵێت: محمد ﷺ پەروەردگاری

(١). أخرجه البخاري ومسلم وهذا لفظ مسلم.

بينيوە، درۆی گەورەی بە ناوی خواوە کردووە، دانیشتم و گوتم: پەلەم لێ مەکە، خوا دەفەرموێت: ﴿ولَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ المُبِينِ﴿٢٣﴾﴾(التکوير)، دەفەرموێت: ﴿ولَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرى﴿١٣﴾﴾(النجم)؟!، گوتی: من یەکەم کەس بووم لەم ئوممەتە ئەو پرسیارەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەرمووی: ئەوە مەبەست جبريلە ﵇ نەيبينيوە لەسەر ئەو شێوەیە کە لەسەری دروستکراوە جگە لەو دووجارە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بينيم لە ئاسمانەوە دادەبەزی لەبەر گەورەيی ئاسۆی نێوان ئاسمان وزەوی داپۆشی بوو، گوتی: نەتبيستووە خوا دەفەرموێت: ﴿لا تُدْرِكُهُ الأبْصارُ وهُوَ يُدْرِكُ الأبْصارَ وهُوَ اللَّطِيفُ الخَبِيرُ﴿١٠٣﴾﴾(الأنعام)، يان نەتبيستووە کە خوا دەفەرموێت: ﴿وما كانَ لِبَشَرٍ أنْ يُكَلِّمَهُ اللهُ إلّا وحْيًا أوْ مِن وراءِ حِجابٍ أوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإذْنِهِ ما يَشاءُ إنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴿٥١﴾﴾(الشورى)...

و مسلم لە ئەبوزەڕەوە ﵁ ڕيوايەتی کردووە دەڵێت: ((سَأَلْتُ رَسولَ اللّهِ ﷺ، هلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قالَ: نُورٌ أنّى أراهُ)).

واتە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پەروەردگارت بینیوە؟ فەرمووی: نورە چۆن بیبینم.

و مسلم لە ئەبوموساوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((حِجابُهُ النُّورُ - وفِي رِوايَةِ أَبِي بَكْرٍ: النّارُ - لَوْ كَشَفَهُ لَأَحْرَقَتْ سُبُحاتُ وجْهِهِ ما انْتَهى إلَيْهِ بَصَرُهُ مِن خَلْقِهِ)).

واتە: پەرژینی نورە، و لە ڕیوایەتێکدا: ئاگرە، ئەگەر لایبدات نورەکانی ڕووی هەموو ئەوەی چاوی دەبینێ لە دروسکراوەکانی دەیسوتاند.

خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێت: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ ﴿١٠٣﴾﴾(الأنعَام).

واتە: چاوەکان ناتوانن گەورەیی خوا دەرك پێ بکەن، و خوا هەموو چاوەکان و خاوەنەکانیان دەبینێت، و دەرك بە هەموو شتەکان دەکات.

هەندێك لە ئەهلی بیدع ڕەواڵەتی ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە بۆ ئەوەی کە خوا سبحانه وتعالى نەلە دونیا و نەلە قیامەتدا نابینرێت، ئەوەش

پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەیە، خوا ﷻ لە دونیادا نابینرێت، بەڵام لە قیامەتدا باوەڕداران دەیبینن، ئەلبانی لەسەر فەرموودەکەی مسلم لە مەسروق و ترمزی لە ئیبن عەباسەوە دەڵێت: ئەبوحاتەم دەڵێت: ئەو کەسەی شارەزای زانستی فەرموودە نییە واگومان دەبات ئەم دوو فەرموودەیە ماناکانیان دژیەکە، بەڵام وانییە چونکە خوا فەزڵ و ڕێزی پێغەمبەرەکەی ﷺ بەسەر پێغەمبەرانی تردا عليهم السلام داوە، هەتاکو جبریل عليه السلام بە ئەندازەی دوو کەوان لە خواوە ﷻ نزیك بوو، و جبریل عليه السلام محمدی ﷺ فێر دەکرد لەو کاتەدا بە دڵی خوای بینی بەوشێوەیەی خوا ویستی لەسەر بووە، و فەرموودەکەی عائیشە رضي الله عنها مەبەستی ئەوەیە دەرکی پێناکرێت نەلە خەودا و نەلە کاتی بە ئاگابووندا، و ئەوەی دەفەرموێت: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ مانای ئەوەیە چاوەکان دەرکی ناکەن، چونکە دەرك کردن بە دەورەدان و تێگەیشتن لە حەقیقەتی دەبێت، بەڵام بینین سەیرکردنی خوایە ﷻ لە قیامەتدا، باوەڕداران دەیبینن بەڵام دەرکی حەقیقەتەکەی ناکەن[1]؛ و ئیبن حبان دەڵێت: لە قیامەتدا دەبینرێت بەڵام چاوەکان دەرکی پێناکەن کاتێك

---

(١). (التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان)(١/١٨٧).



کە دەیبینن، چونکە دەرك کردن بریتییە لە دەورەدان بەڵام بینین سەیرکردنە، خوا ﷻ دەبینرێت بەڵام دەرك بە خودی ناکرێت[١]؛ و بەغەوی دەڵێت: دەرك کردن جیاوازە لە بینین، چونکە دەرك کردن بریتییە لە تێگەیشتن لە حەقیقەت و خودی شتەکە و دەورەدانی، بەڵام بینین سەیرکردنە، لەوانەیە بینین بەبێ دەرك پێکردن ڕووبدات[٢]؛ و شەنقیتی دەڵێت: دەرك کردن تایبەتترە لە بینین بە ڕەهایی، عەرەب دەڵێن: شتەکەم بینی بەڵام دەرکم پێنەکرد، مانای: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾، ناتوانرێت دەورە بدرێت، وەك چۆن دروستکراوەکان خوا دەناسن بەڵام زانستیان دەورەی نەداوە[٣]؛ و ئیبن قەیم دەڵێت: دارمی کۆدەنگی هاوەڵانی گێڕاوەتەوە کە لە شەوی میعراجدا پێغەمبەری خوا ﷺ خوای نەبینیوە، و هەندێکیان ئیبن عەباس رضي الله عنهما لەو کۆ دەنگییە دەردەکەن، و شێخمان ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئەوە ناکۆکی نییە لە ڕاستیدا، چونکە ئیبن عەباس رضي الله عنهما نەیگوتووە بە چاوی بینیویەتی[٤]؛

---

(١). (صحيح ابن حبان)(٢٥٧/١).
(٢). (معالم التنزيل في تفسير القرآن)(١٧٤/٣).
(٣). (دفع إيهام الاضطراب عن آيات الكتاب)(٩٢).
(٤). (اجتماع الجيوش الإسلامية)(٤٨/٢).

و ئیبن تەیمییە دیسان دەڵێت: ئەوەی کە بە صەحیحی لە ئیبن عەباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە کە دەڵێت: محمد ﷺ دووجار بە دڵی خوای بینیوە، و عائیشە ﵂ بینینی نکوڵی کردووە، هەندێك ئەو گوتانەیان کۆ کردووەتەوە بەوەی عائیشە ﵂ نکوڵی بینینی چاوی کردووە، و ئیبن عەباس ﵄ بینینی دڵی سەلماندووە[(١)]؛ کەواتە بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کەس لە دونیا بە چاو خوای نەبینیوە هەتاکو پێغەمبەری خواش ﷺ لە شەوی میعراجدا، بەڵام کۆمەڵێك فەرموودەی زۆرمان هەیە کە بینینی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ باوەڕداران دەسەلمێنن، ئەحمەد نەجمی دەڵێت: لە فەتواکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییەدا هاتووە دەڵێت: لە ئیبن عەباسەوە جێگیر بووە دەڵێت: محمد ﷺ دوو جار بە دڵی پەروەردگاری بینیوە، و عائیشە نکوڵی بینینی کردووە.

هەندێك ئەو دوو بۆچوونەیان کۆ کردووەتەوە بەوەی عائیشە نکوڵی بینینی چاوی کردووە، و ئیبن عەباس بینینی دڵی جێگیر کردووە.

(١). (مجموع الفتاوی)(٥٠٩/٦).

و ئەو لەفزانە لە ئیبن عەباسەوە جێگیر بووە ڕەهایە یان وابەستەیە بە بینینی دڵەوە، جارێك دەڵێت: محمد ﷺ پەروەردگاری بینیوە، و جارێك دەڵێت: محمد ﷺ بینیویەتی، و لەفزێکی ڕاشکاو جێگیر نەبووە کە بە چاوی بینیویەتی.

دەڵێت: هەروەها ئیمام ئەحمەد جارێك بە ڕەهایی باسی بینین دەکات، و جارێك دەڵێت: بە دڵی بینیویەتی، و کەس ناڵێت گوێم لە ئیمام ئەحمەد بوو بڵێت: بە چاوی بینیویەتی، بەڵام کۆمەڵێك لە هاوەڵانی قسە ڕەهاکەیان بیستووە، بە بینینی چاو تێگەیشتوون، وەك چۆن خەڵك ڕەهایی قسەی ئیبن عەباسیان بیستووە بە بینینی چاو تێگەیشتوون، و لە بەڵگەکاندا ئەوە نییە بیسەلمێنێت بە چاوی پەروەردگاری بینیوە، و ئەوە لە هیچ هاوەڵێکەوە جێگیر نەبووە، و لە قورئان و سوننەتیشدا بەڵگە نییە لەسەری، بەڵکو دەقە صەحیحەکان بەڵگەن لەسەر نەفی بینین لە دونیا، وەك لە صەحیحی مسلم دا هاتووە

له ئەبوزەرەوە ﷺ دەڵێت: ((سَأَلْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ، هلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قالَ :نُورٌ أنَّى أراهُ))[1].

بەڵام عوبید جابری دەڵێت: مەبەستی ئیمام ئەحمەد رحمه الله بینینی خوا نییە لە شەوی ئیسرا و میعراجدا، کەواتە مەبەستی چییە لەوەی دەڵێت: پێغەمبەرمان ﷺ پەروەردگاری بینیوە؟ ئاماژە بۆ فەرموودەیەکی تر دەکات کە فەرموودەی گفتوگۆی فریشتە بەرزەکان (اختصام الملإ الأعلى)کە لە موعاز و ئیبن عەباسەوە جێگیر بووە، و لەو لەفزانەی کە جێگیر بووە لە موعازەوە ﷺ دەڵێت: ((احتُبِسَ علينا رسولُ اللهِ ﷺ ذاتَ غداةٍ في صلاةِ الصُّبحِ حتّى كِدنا نتراءى قرنَ الشَّمسِ، فخرجَ رسولُ اللهِ ﷺ سريعًا فثوِّبَ بالصَّلاةِ وصلّى وتجوَّزَ في صلاتِهِ، فلمّا سلَّمَ، قالَ: كما أنتُمْ على مصافِّكم "ثمَّ أقبلَ إلَينا" فقالَ: إنِّي سأحدِّثُكُم ما حبسَني عنكمُ الغداةَ إنِّي قمتُ منَ اللَّيلِ فصلَّيتُ ما قُدِّرَ لي فنَعَستُ في صَلاتي حتى استَيقَظتُ، فإذا أنا بربِّي في أحسنِ صورةٍ...))[2].

---

(١). (شرح أصول السنة)(٨٥).
(٢). أخرجه أحمد وابن خزيمة وصححه الألباني.

واتە: بەیانییەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی درەنگ هات بۆ لامان، هەتاکو خەریك بوو خۆر هەڵبێت و تیشکی خۆر ببینین، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرچوو خێرا قامەتکرا بۆ نوێژ و نوێژی کورت کردەوە و خێرا ئەنجامیدا، کاتێك سەلامیدایەوە، فەرمووی: لە ڕیزەکانی خۆتان دابنیشن، پاشان ڕووی تێکردین و فەرمووی: من باسی ئەوەتان بۆ دەکەم کە چی بووە هۆی درەنگ دەرچوونم بۆ لاتان، من لە شەو هەستام و نوێژم کرد ئەوەندەی بۆم نوسرابوو، لە نوێژەکەمدا وەنەوز گرتمی و هەتاکو لە خەو ڕابووم، پەروەردگارم بینی لەسەر جوانترین شێوە...

ئەمە ئەو فەرموودەیە کە ئیمام ئەحمەد رحمه الله ئاماژەی بۆ دەکات، زانایان سەبارەت بەم پرسە چەند بۆچوونێکیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن: بینینە لە خەودا، و هەیانە دەڵێن: صەحیح نییە، و ئەوەی صەوابە صەحیحە وەك ئیمام ئەحمەد رحمه الله وادەڵێت، و لەفزەکە ڕاشکاوە دەفەرموێت: ((اسْتَيقَظتُ))، ناشێت بە کەسی خەوتوو بگوترێت: لە خەو هەستاوە، خەوتوو خەوتووە، لە خەوهەستا و لە خەوڕابووە،.... بەوەش سەلما پێغەمبەری خوا ﷺ لەو حاڵەتەدا

پەروەردگاری بینیوە، ئەگەر گوتمان لە کاتی خەودا بووە، خەوی پێغەمبەران حەقە، بە خەبەربن یان خەوتبن، و بنەمایە لە دەقەکاندا ڕەواڵەتە بە گوێرەی زمانی عەرەبی لێکدەدرێتەوە کاتێك بە ڕەهایی دێت، هەتاکو لەفزێکی صەحیح لەو ڕەواڵەتە لای دەدات[1].

(١). (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)(٧٥-٧٦).



## تەرازوو دادەنرێت بۆ کێشانەی بەندە و کردارەکانی

**(وَالْإِيمَان بالميزان يَوْم الْقِيَامَة كَمَا جَاءَ في الحديث: (يُوزن العَبْد يَوْم الْقِيَامَة فَلَا يزن جنَاح بعوضة)[1]، ويوزن أَعمال الْعباد كَمَا جَاءَ فِي الْأَثر وَالْإِيمَان بِهِ والتصديق بِهِ والإعراض عَن من رد ذَلِك وَترك مجادلته).**

**واتە: باوەڕ بوون بە تەرازوو لە ڕۆژی قیامەتدا وەك لەم فەرموودەیە هاتووە: بەندە هەیە لە ڕۆژی قیامەت دەکێشرێت، کێشی باڵە مێشوولەیەکی نییە، و کردەوەکانی بەندەکان دەکێشرێن وەك لە ئەسەردا هاتووە، پێویستە باوەڕت پێی هەبێت و بە ڕاستی بزانیت، و پشت هەڵبکرێت لەو کەسەی ئەوە ڕەت دەکاتەوە و مشتومڕی لەگەڵدا نەکرێت.**

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾﴾(الأنبياء).

---

(١). أخرجه البخاري ومسلم.



واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازووی دادگەری دادەنێن، هیچ ستەمێك لە کەس ناکرێت، ئەگەر کێشی تۆوی خەردەلەیەکیش لە چاکە یان خراپەی هەبێت دەهێنین، ئەوەندە بەسە ئێمە کردەوەکان بژمێرین و پاداشتیان بدەینەوە لەسەری.

شەنقیتی دەڵێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ﴾ کۆی تەرازووە، ئەوەی ڕەواڵەتی ئایەتەکانی قورئانە هەرکەسێك چەند تەرازوویەکی بۆ دادەنرێت، چونکە دەفەرموێت: ﴿فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ١٠٢﴾(المُؤۡمِنُون)، و دەفەرموێت: ﴿وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ١٠٣﴾(المُؤۡمِنُون)، کەواتە: ڕەواڵەتی قورئان بەڵگەیە کە هەرکەسێك چەند تەرازوویەکی هەیە، و بە هەریەکەیان جۆرێك لە کردەوەکانی دەپێون، و ئەوەی کە ڕێسایە لە زانستی (الأصول)دا ڕەواڵەتی قورئان نابێت لێی لابدرێت ئیللا بە بەڵگەیەك نەبێت پێویست بکات بگەڕێتەوە بۆ لای، و ئیبن کەسیر دەڵێت: زۆربەی زانایان بۆچوونیان وایە کە یەك تەرازووە، بەڵام کۆکراوەتەوە بە ئیعتباری جۆری ئەو کردەوانەی پێی دەپێورێت[1].

(١). (أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن)(١٥٩/٤).

ئەحمەد و ترمزی وئیبن ماجه له عبداللهی كوڕی عەمرەوە ﵄ ڕیوایەتیان كردووه و ئەلبانی به صەحیحی داناوه، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ اللَّهَ سيُخَلِّصُ رجلًا من أمَّتي على رؤوسِ الخلائقِ يومَ القيامةِ فينشُرُ علَيهِ تسعةً وتسعينَ سجلًّا، كلُّ سجلٍّ مثلُ مدِّ البصرِ ثمَّ يقولُ: أتنكرُ من هذا شيئًا؟ أظلمَكَ كتبتي الحافِظونَ؟يقولُ: لا يا ربِّ، فيقولُ: أفلَكَ عذرٌ؟ فيقولُ: لا يا ربِّ، فيقولُ: بلَى، إنَّ لَكَ عِندَنا حسنةً، وإنَّهُ لا ظُلمَ عليكَ اليومَ، فيخرجُ بطاقةً فيها أشهدُ أن لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، وأشهدُ أنَّ محمَّدًا عبدُهُ ورسولُهُ، فيقولُ: احضُر وزنَكَ فيقولُ يا ربِّ، ما هذِهِ البطاقةُ ما هذِهِ السِّجلَّاتِ؟ فقالَ: فإنَّكَ لا تُظلَمُ، قالَ: فتوضَعُ السِّجلَّاتُ في كفَّةٍ، والبطاقةُ في كفَّةٍ فطاشتِ السِّجلَّاتُ وثقُلتِ البطاقةُ، ولا يثقلُ معَ اسمِ اللَّهِ شيءٌ)).

واته: خوا ﷻ كەسێك له ئوممەتەكەم هەڵدەبژێرێت له ڕۆژی قیامەتدا به پێش چاوی هەموو خەڵكەوە، نەوەد و نۆ تۆماری تاوانی پیشان دەدرێت هەریەكەیان به دووری بینینی چاو درێژه، پاشان خوا ﷻ پێی دەفەرموێت: نكوڵی هیچ لەمانە دەكەیت، ئایا فریشتەكانم كه كردەوەی بەندەكانیان دەنووسی هیچ ستەمێكیان لێكردوویت؟ دەڵێت:

نەخێر، ئەی پەروەردگارم، پێی دەفەرموێت: ئایا هیچ بیانوویەکت هەبوو؟، دەڵێت: نەخێر، ئەی پەروەردگارم، پێی دەفەرموێت: بەڵکو چاکەیەکت هەیە، چونکە تۆ ئەمڕۆ هیچ ستەمێکت لێناکرێت، بلیتێك دەردەهێنرێت: (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) تێدایە، پێی دەفەرموێت: ئامادەی کێشانەی کردەوەکانت بە، دەڵێت: ئەم بلیتە چی لەم هەموو تۆمارە دەکات، پێی دەفەرموێت: تۆ ستەمت لێناکرێت، هەموو تۆمارەکان دەخرێتە تایەکی تەرازووەکەوە، و بلیتەکە دەخرێتە تاکەی تریيەوە، هەموو تۆمارەکان بلاّوە پێدەکات و بلیتەکە قورسترە، هیچ شتێك لەگەڵ ناوی خوادا کێشی نییە و قورس نییە.

و خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ۝٨﴾(الأَعْرَاف).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازوو دادەنرێت، کردەوەکانی بەندەکان دادگەرانە پێی دەپێورێت، هەرکەسێك تای تەرازووی چاکەکانی قورستربێت ئەوانە سەرفرازن.

ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿وَٱلۡوَزۡنُ﴾ کێشانەی کردەوەکان لە ڕۆژی قیامەتدا بە ﴿ٱلۡحَقُّ﴾ دادگەرانەیە خوا ستەم لە کەس ناکات، وەك دەفەرمویت: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ٤٧﴾(الأنبيَاء)، پاشان دەڵێت: ئایا ئەوەی دەخرێتە سەر تای تەرازوو لە ڕۆژی قیامەتدا چییە؟ گوتراوە: کردەوەکانە ئەگەرچی شتێکی مەعنەوین بەڵام خوا دەیانکات بە تەن و شتی بەرجەستە، و گوتراوە: تێنووسی کردەوەکان دەکێشرێت، وەك لە فەرموودەی (البطاقة)دا هاتووە، و گوتراوە: خاوەن کردەوەکان دەکێشرێن، وەك لەو فەرموودەدا هاتووە کە بوخاری ڕیوایەتی کردووە و دەفەرمووێت: ((يؤتى يومَ القيامةِ بالرَّجلِ السَّمينِ، فلا يزِنُ عند اللهِ جناحُ بعوضةٍ))، واتە: کەسێکی قەڵەوی زل دەهێنن، لای خوا کێشی باڵە مێشوولەیەکی نییە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا ١٠٥﴾(الکَهْف)، و ئەحمەد و ئیبن حبان لە باسی فەزڵ و ڕێزی ئیبن مەسعوددا ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە



حەسەنی داناوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَتَعْجَبُونَ مِن دِقَّةِ ساقَيْه! والَّذي نفسي بيدِه لهما في الميزانِ أثقلُ من أُحُدٍ))، واتە: ئایا سەرتان سوڕدەمێنێت لە لاوازی لاقەکانی، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەو دوولاقە لە تەرازوودا لە کێوی ئوحود قورسترن[1]؛ و دەتوانرێت ئەم ئایەت و فەرموودانە کۆ بکرێنەوە بەوەی: هەندێك جار کردەوەکان دەکێشرێن، و هەندێك جار ئەو تێنوسانەی تیایدا نوسراون وهەندێك جار خاوەن کردەوەکان دەکێشرێن، و ئەلبانی لەسەر فەرموودەی (البطاقة) دەڵێت: ئەم فەرموودە بەڵگەیە کە تەرازووی کێشانەی کردەوەکان دوو تای هەیە و دەبینرێن، و کردەوەکان ئەگەرچی شتی مەعنەوین بەڵام دەکێشرێن، و خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، ئەوەش لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەتە وفەرموودەی زۆر لەو بارەوە هاتووە[2]؛ هەندێك لە زانایانی سوننەت دەڵێن: ئەو تەرازووەی کە کردەوەکانی پێ دەپێورێت زمانی هەیە، ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەبوئیسحاق دەڵێت: ئەهلی سوننەت کۆڕان

(١). بڕوانە: (تفسير القرآن العظيم)(٣/٣٩٠).
(٢). (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها)(١/٢٦٣).



کە پێویستە باوەڕمان بە تەرازووی کێشانەی کردەوەکان هەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا، و تەرازووەکە دوو تای هەیە و زمانی هەیە لە کاتی کێشانەی کردەوەکاندا لاسەنگ دەبێت[1]؛ و ئیبن بەتال دەڵێت: ئەهلی سوننەت کۆڕان لەسەر باوەڕ بە تەرازوو، و کردەوەی بەندەکان دەکێشرێت لە ڕۆژی قیامەتدا، و تەرازوو زمان و دوو تای هەیە[2]؛ و فەوزان دەڵێت: تەرازوو زمانی هەیە مەبەست ئەو زمانەی تاکانی تەرازووەکەیە کە ئاماژەیە بۆ لاسەنگی و پارسەنگی ئەو شتانەی کە پێی دەکێشرێت[3].

و ئەحمەدی نەجمی دەڵێت: زانایان ناکۆکن لە کێشانەی جەستەکان دوای کۆکییان لەسەر کێشانەی کردەوەکان، دەڵێم: ئەوەی صەحیحە جەستەکانیش کێشانە دەکرێن وەك چۆن کردەوە و جەستەکان کێشانە دەکرێن، بەڵگە لەسەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ العَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ القِيامَةِ، لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَناحَ بَعُوضَةٍ، وقالَ: اقْرَءُوا، ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَزْنًا﴾(الكَهْف).

---

(١). (فتح الباري)(٥٣٨/١٣).
(٢). (شرح صحيح البخاري)(٥٥٩/١٠).
(٣) . مادة صوتية من هذا الرابط: (https://youtu.be/-GnLGZD٨Mwk).



واتە: کەسی زل وقەڵە ودەهێنن لە ڕۆژی قیامەتدا، لای خوا سەنگی باڵە مێشوولەیەکی نییە، وفەرمووی: ئەو ئایەتە بخوێننەوە: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا﴾(الكَهْف).

هەروەها ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئیبن مەسعود رضي الله عنه سەرکەوتە سەر دارێك بۆ ئەوەی بەرهەمی کوباس بچنێتەوە، ئەوەی بینیان سەریان سوڕما لە لاوازی لاقەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((أَتَعْجَبونَ مِن دقَّةِ ساقَيهِ، فَوَاللهِ لهما أثقَلُ في الميزانِ مِن أُحُدٍ))[1].

واتە: سەرتان سوڕ دەمێنێت لە لاوازی لاقەکانی، سوێند بە خوا ئەو دوو لاقە لە تەرازودا لە کێوی ئوحد قورسترن.

و کێشانەی کردەوەکان بەڵگەی زۆری لەسەر هاتووە لەوانە فەرموودەی بیتاقە و جگە لەویش.

(١). أجرجه أحمد، وصححه الألباني بلفظ: ((ممَّ تَضحكونَ قالوا: مِن دقَّةِ ساقَيهِ، فقالَ: والَّذي نَفسي بيدِهِ لهِيَ أثقَلُ في الميزانِ مِن أُحُدٍ)).

و ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: ((ما مِن شَيْءٍ فِي المِيزانِ أثْقَلُ مِن حُسْنِ الخُلُقِ))[١].

واتە: هیچ شتێك نییە لە تەرازووی کردەوەکاندا قورستربێت لە ڕەوشت جوانی.

و ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: ((كَلِمَتانِ خَفِيفَتانِ عَلى اللِّسانِ، ثَقِيلَتانِ فِي المِيزانِ، حَبِيبَتانِ إلى الرَّحْمَنِ: سُبْحانَ اللَّهِ العَظِيمِ، سُبْحانَ اللَّهِ وبِحَمْدِهِ))[٢].

واتە: دوو ڕستە ئاسانن لەسەر زمان، و قورسن لە تەرازووی کردەوەکان، و خۆشەویستن بە لای خوای میهرەبانەوە، سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم.

ئەم فەرموودانە هەموو صەحیحن، موعتەزیلە باوەڕیان بە تەرازوو و سزای گۆڕ نییە، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕیان پێی هەیە[٣].

---

(١). أخرجه أحمد وأبوداو الترمذي وصححه الألباني.
(٢). أخرجه البخاري ومسلم.
(٣). (شرح أصول السنة)(٨٧-٨٩).

## خوا ﷻ لەگەڵ هەموو بەندەیەکیدا قسە دەکات

**(وأَن الله تَعَالَى يكلمهُ الْعباد يَوْم الْقِيَامَة لَيْسَ بَينهم وَبَينه ترجمان، والإيمان به والتصديق بِهِ).**

**واتە: خوا ﷻ قسە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، لە نێوان بەندەکان و خوادا وەرگێڕ نییە، و باوەڕمان پێی هەیە و بە ڕاستی دەزانین.**

بوخاری و مسلم لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ما مِنكُمْ مِن أحَدٍ إلّا وسَيُكَلِّمُهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيامَةِ، لَيْسَ بَيْنَ اللَّهِ وبَيْنَهُ تُرْجُمانٌ)).

واتە: کەس لە ئێوە نییە ئیللا خوا ﷻ قسەی لەگەڵدا دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، لە نێوان خوا ﷻ و ئەو کەسەدا وەرگێڕ نییە.

و بوخاری لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ أحَدُكُمْ يَوْمَ يَلْقاهُ، ولَيْسَ بَيْنَهُ وبَيْنَهُ تَرْجُمانٌ يُتَرْجِمُ لَهُ، فَلَيَقُولَنَّ لَهُ: ألَمْ

أبْعَثْ إلَيْكَ رَسُولًا فَيُبَلِّغَكَ؟ فَيَقُولُ: بَلى، فَيَقُولُ: أَلَمْ أُعْطِكَ مالًا وأُفْضِلْ عَلَيْكَ؟ فَيَقُولُ: بَلى)).

کەسێك لە ئێوە دەگاتە دیداری خوا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا، لە نێوان پەروەردگار و بەندەکەیدا وەرگێڕ نییە قسەکانی وەربگێڕێت، خوا ﷻ پێی دەفەرموێت: ئایا پێغەمبەرم بۆ ڕەوانە نەکردیت؟ دەڵێت: بەڵێ، پێی دەفەرموێت: ئایا سامانم پێ نەبەخشیت و فەزڵم نەکرد بەسەرتدا؟ دەڵێ: بەڵێ.



## پێغەمبەری خودا ﷺ حەوزی

## کەوسەری پێ دەبەخشرێت لە قیامەتدا

**(وَالْإِيمَان بالحوض وَأَن لرَسُول الله حوضا يَوْم الْقِيَامَة يرد عَلَيْهِ أمته عرضه مثل طوله مسيرَة شهر آنيته كعدد نُجُوم السَّمَاء على مَا صحت بِهِ الْأَخْبَار من غير وَجه).**

**واتە: و باوەڕ بوون بە حەوز، و بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئوممەتەکەی دەچنەسەری درێژییەکەی وەك پانییەکەیەتی و یەك مانگ ڕۆژەڕێ درێژە، پەرداخەکانی بە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، بەو شێوەیە لە فەرموودەدا بە صەحیحی هاتووە لە زیاتر لە ڕێگایەکەوە.**

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١﴾(الكَوثَر).

واتە: بێگومان ئێمە حەوزی کەوسەرمان پێبەخشیویت.

بوخاری لە ئەنەسەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ قَدْرَ حَوْضِي كَما بَيْنَ أيْلَةَ إلى صَنْعاءَ مِنَ اليَمَنِ، وإنَّ فِيهِ مِنَ الأبارِيقِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّماءِ)).

واتە: بێگومان پانتایی حەوزەکەم وەك دووری نێوان ئەیلە[1] بۆ صەنعایە لە یەمەن، و بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمان پەرداخی تێدایە.

دیسان مسلم لە ئەنەسەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَيَرِدَنَّ عَلَيَّ ناسٌ مِن أصْحابِي، حَتّى إذا عَرَفْتُهُمُ اخْتَلَجُوا دُونِي، فَأقُولُ: أُصَيْحابِي، فَيَقُولُ: لا تَدْرِي ما أحْدَثُوا بَعْدَكَ)).

واتە: کەسانێك دێنە سەر حەوز لە شوێنکەوتووانم لە ئوممەتەکەم، هەتاکو دەیانناسمەوە و پێش ئەوەی بگەنە من لە نێو ئەو خەڵکانە دەریان دەهێنن، دەڵێم: هاوەڵانم، دەڵێت: تۆ نازانیت دوای تۆ چییان داهێناوە.

---

(١). شوێنی شاری عەقەبەی ئێستایە لە باشوری وڵاتی ئوردن.

ئەلبانی دەڵێت: ئەو فەرموودانەی دەربارەی حەوز هاتووە زۆر زۆرن و گەیشتووەتە ئاستی تەواتور، و هەندێك لە پێشەواكان ئەوەیان بە ڕاشكاوی باسكردووە، و سی و ئەوەندە لە هاوەڵان گێڕاویانەتەوە، حافز ئیبن كەسیر لە كۆتایی كتێبی (النهاية) بەدواداچوونی بۆ كردووە، و حافز ئیبن ئەبوعاصم لە (كتاب السنة) حەوت بابەتی لەسەر نوسیوە...، و لە كۆتاییەكەیدا ئاماژە بەوە دەكات كە موتەواترە و دەڵێت: و ئەو هەواڵانەی كە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حەوز باسمان كرد، زانست پێویست دەكات[١].

صالح آل الشيخ دەڵێت: ڕێزنان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەم حەوزە مانای ئەوە نییە حەوز تایبەتە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵكو لە فەرموودەیەكدا هاتووە: ((إنّ لكل نبي حوضا))[٢]، واتە: بێگومان هەموو پێغەمبەرێك حەوزی هەیە[٣].

((١)). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٣٧).
(٢). رواه الترمذي(٢٤٤٣) وصححه الألباني.
(٣). (شرح العقيدة الطحاوية)(ص١٩٠).

## سزای گۆڕ حەقە

**(والْإِيمَان بِعَذَاب الْقَبْر، وَأَن هَذِه الْأمة تفتن فِي قبورها وتسأل عَن الْإِيمَان وَالْإِسْلَام وَمن ربه وَمن نبيه ويأتيه مُنكر وَنَكِير كَيفَ شَاءَ وَكَيف أَرَادَ وَالْإِيمَان بِهِ والتصديق بِهِ).**

**واتە: باوەڕبوون بە سزای گۆڕ لە بنەمای ئەهلی سوننەیە، ئەم ئوممەتە لە گۆڕەکانیاندا تاقی دەکرێنەوە، و پرسیاری باوەڕ و ئیسلامی لێ دەکرێت، و کێ پەروەردگاریەتی، و کێ پێغەمبەریەتی، و هەردوو فریشتەی مونکەر و نەکیر دێن بۆ لای، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی پێکردووە و چۆن ویستویەتی، پێویستە باوەڕمان پێی هەبێت و بە ڕاستی بزانین.**

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾(غَافِر).

واتە: هەموو بەیانیان و ئێوارانێك ئاگری دۆزەخیان پیشان دەدرێت و سزا دەدرێن، و ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت فیرعەون و

داروده‌سته و شوێنکه‌وتوانی بخه‌نه دۆزه‌خه‌وه و توندترین سزایان بده‌ن.

ئه‌م ئایه‌ته به‌ڵگه و بنه‌مای سزای ناوگۆره، ئه‌م پرسه لای ئه‌هلی سوننه جێگیربووه له گۆڕ و ژیانی به‌رزه‌خدا سزا هه‌یه، به‌ڵام زۆرێك له كۆمه‌ڵ و تاقمه گومڕاكان نكوڵی سزای گۆڕ ده‌كه‌ن، له‌وباره‌یه‌وه پێشه‌وا ئیبن كه‌سیر باسێكی هێناوه كه ئه‌مه كورته و پوخته‌كه‌یه‌تی، ده‌ڵێت: ئه‌م ئایه‌ته بنه‌مایه‌كی گه‌وره‌یه بۆ ئه‌هلی سوننه و كردوویانه‌ته به‌ڵگه له‌سه‌ر سزای به‌رزه‌خ له گۆردا، كه ده‌فه‌رموێت: ﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ﴾، به‌ڵام لێره پرسیارێك هه‌یه، گومان له‌وه نییه ئه‌م ئایه‌ته مه‌ككییه، و كردوویانه‌ته به‌ڵگه بۆ سزای ناوگۆر له به‌رزه‌خدا، به‌ڵام ئیمام ئه‌حمه‌د له سه‌عیدی كوڕی عاصه‌وه رضي الله عنه ریوایه‌تی كردووه ده‌ڵێت: عائیشه ئافره‌تێكی جووله‌كه خزمه‌تی ده‌كرد، عائیشه هیچ چاكه‌یه‌كی بۆ نه‌ده‌كرد ئیللا ئافره‌ته جووله‌كه‌كه ده‌یگوت: خوا له سزای گۆر بتپارێزێت، عائیشه ده‌ڵێت: ڕۆژێك پێغه‌مبه‌ری خوا هاته ژووره‌وه بۆ لام گوتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا، ئایا سزای گۆڕ هه‌یه پێش ڕۆژی قیامه‌ت، فه‌رمووی: نه‌خێر بۆچی ده‌پرسیت؟ گوتی: ئه‌م ئافره‌ته

جوولەکەیە، هیچ چاکەیەکی لەگەڵدا ناکەم ئیللا دەڵێت: خوا بتپارێزێت لە سزای گۆڕ، فەرمووی: جوولەکە درۆ دەکەن، و بە ناوی خوا زیاتر درۆ دەکەن، سزا نییە پێش ڕۆژی قیامەت، پاشان دوای ئەوە مایەوە ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو، ڕۆژێ لە نیوەڕۆدا پۆشاکەکەی لە خۆی ئاڵاندبوو و لە ماڵ دەرچوو، و چاوەکانی سوربوویەوە، بە بەرزترین دەنگی هاوار دەکرد: گۆڕ وەك پارچەیەکی شەو تاریکە ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن زۆر دەگریان و کەم پێدەکەنین، ئەی خەڵکینە پەنا بە خوا بگرن لە سزای گۆڕ، چونکە سزای گۆڕ حەقە؛ سەنەدەکەی لەسەر مەرجی بوخاری و مسلمە بەڵام ڕیوایەتیان نەکردووە، دیسان ئەحمەد لە عروەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: عائیشە ئافرەتێکی جوولەکە داوای لێکرد، پێی بەخشی، لە وەڵامیدا گوتی: خوا پەنات بدا لە سزای گۆڕ، عائیشە نکولی ئەوەی لێکرد، کاتێك پێغەمبەری خوای ﷺ بینی پێی گوت، فەرمووی: نییە، عائیشە دەڵێت: پاشان دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: وەحیم بۆ کراوە ئێوە لە گۆڕەکانتاندا تاقی دەکرێنەوە ئەمەش لەسەر مەرجی بوخاری و مسلمە، دەگوترێت: چۆن ئەم فەرموودانە لەگەڵ ئەم



ئایەتە مەکییە کۆ دەکرێنەوە، کە بەڵگەی تێدایە لەسەر سزای بەرزەخ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕۆحەکان لە بەرزەخدا بەیانیان و ئێواران عەرزی ئاگر دەکرێن، و بەڵگەی ئەوەی تێدا نییە ئێشەکەی دەکاتە لاشەکان لە گۆڕەکاندا، لەوانەیە ئەوە تایبەت بێت بە ڕۆحەکانەوە، بەڵام سەبارەت بە سزای ناو گۆڕ بۆ لاشە و ئازاری چەشتنی لە گۆڕدا، تەنها سوننەتی صەحیح بەڵگەیە لەسەری، و لەوانەیە بگوترێت: ئەم ئایەتە تەنها بەڵگەیە لەسەر سزای بێباوەڕان لە بەرزەخدا، و لازم نییە باوەڕدار لە گۆڕەکەیدا سزا بدرێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئیمام ئەحمەد و مسلم لە عورووەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەژوورەوە و ئافرەتێکی جوولەکەم لابوو، دەیگوت: ئایا دەزانیت ئێوە تووشی فیتنە دەبن لە گۆڕەکانتان، پێغەمبەری خوا ﷺ سڵەمییەوە، فەرمووی: تەنها جوولەکە تووشی فیتنە دەبن، عائیشە دەڵێت: چەند شەوێك ماینەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا دەزانیت وەحیم بۆ کرا ئێوە تاقی دەکرێنەوە لە گۆڕەکانتاندا، و عائیشە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ پەنای بە خوا دەگرت لە سزای گۆڕ؛ و

لەوانەیە بگوترێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر سزای ڕۆحەکان لە بەرزەخدا، بەڵام لازم نییە بگاتە لاشەکان لە گۆڕەکانیاندا، بەڵام کاتێك وەحی بەتایبەت بۆ کرا لەسەر ئەو بابەتە پەنای بە خوا گرت لە سزای گۆڕ، و بوخاری لە مەسروقەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ئافرەتێکی جوولەکە چوو بۆ لای عائیشە، گوتی: خوا پەنات بدات لە سزای گۆڕ، عائیشە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کرد سەبارەت بە سزای گۆڕ؟ فەرمووی: بەڵێ، سزای گۆڕ حەقە، عائیشە دەڵێت: دوای ئەوە پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینی نوێژێك ئەنجام بدات ئیللا پەنای بە خوا دەگرت لە سزای گۆڕ، ئەمەش بەڵگەیە لەم فەرموودەیەدا ئافرەتە جوولەکەکەی بە ڕاست خستووەتەوە، پشتگیری قسەکەی کردووە، بەڵام لە فەرموودەکانی پێشوو نکوڵی کرد هەتاکو وەحی بۆ هات، لەوانەیە دوو باسی جیاوازبێت، والله أعلم، و فەرموودە لەسەر سزای گۆڕ زۆر زۆرە؛ و قەتادە دەڵێت: ﴿غُدُوًّا وَعَشِيًّا﴾ واتە: بەیانیان و ئێواران، هەتا ئەو کاتەی دونیا دەمێنێت، پێیاندەگوترێت: ئەی دارودەستەی فیرعەون ئەمە شوێنەکانتانە، وەك سەرزەنشت و سزا و سوکایەتی پێکردنیان؛ و ئەحمەد و بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما

ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسێك لە ئێوە ئەگەر مرد بەیانیان و ئێواران شوێنەکەی پیشان دەدرێت، ئەگەر ئەهلی بەهەشتبێت لە بەهەشت، و ئەگەر ئەهلی دۆزەخ بێت لە دۆزەخ، دەگوترێت: ئەمە شوێنتە هەتاکو خوا ﷻ زیندووت دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەت[1]؛ و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: بەڵگەی تر لە قورئان لەسەر سزای گۆڕ ئەو ئایەتەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ﴿٩٣﴾﴾(الأنعام)، ﴿ٱلْيَوْمَ﴾ ئەو ڕۆژە کەیە؟، واتە: ئەو ڕۆژەی کە ڕۆژی مردنتانە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سزای گۆڕ، بەڵام لە سوننەتدا متەواترە، فەرموودەی زۆری جۆراوجۆری بە گشتی و تایبەتە لەسەر هاتووە لە فەرموودە تایبەتەکان ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای دوو گۆڕدا تێپەڕی فەرمووی: ئەو دوو کەسە لە گۆڕدا سزا دەدرێن لەسەر دوو تاوان کە بە گەورەیان نەدەزانی؛ و ئیجماع لەسەر ئەو پرسە هەیە و هەموو

(١). بڕوانە: (تفسير القرآن العظيم)(١٤٦/٧).



موسڵمانان لە نوێژەکانیاندا دەڵێن: پەنا بە خوا دەگرم لە سزای دۆزەخ، و لە سزای گۆڕ؛ و ئەم پرسە کێشەی لەسەر نییە، و لە بیروباوەڕمانە، ئەگەر کەسێك بڵێت: سزا لەسەر لاشەیە یان لەسەر ڕۆحە یان لەسەر هەردووکیانە پێکەوە؟ دەڵێین: ئەوەی ڕەواڵەتی سوننەتە سزا لەسەر لاشەیە لە کاتی پرسیاری دوو فریشتەکە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کەسی دووڕوو و ڕاڕای کردووە دەفەرموێت: پرسیاری لێ دەکەن دەڵێت: نازانم، بیستم خەڵك شتێکیان دەگوت، منیش گوتم، بە چەکوشێکی ئاسن پێیدا دەکێشرێت ناڵە و هاوارێك دەکات هەموو شتێك دەیبیستێت جگە لە مرۆڤ و جن؛...ئەمە بەڵگەیە لە کاتی لێپرسینەوەدا سزا لەسەر لاشەیە لەبەر ئەوەی دەفەرموێت: پێیدا دەکێشرێت، بەڵام دوای ئەوە بنەڕەت ئەوەیە سزا لەسەر ڕۆحە، و لەوانەیە بگاتە لاشەش وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە بۆچوونی وایە، ئەگەر بمانەوێت دەڵێین: ئەمە باسێکە پێویست نییە، و هاوەڵان پرسیاریان دەربارەی نەکردووە، بۆیە سزای گۆڕ دانپێدادەنێین بەوشێوەیەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، نەهیچی بۆ زیاد دەکەین و



نەهیچی لێکەم دەکەین[1]؛ ئەو کەسەی نکولی سزای گۆڕ بکات ئیبن باز دەڵێت: هەرکەسێك نکولی سزای گۆڕ بکات داوای لیٚ دەکرێت تەوبە بکات، ئەگەر تەوبە نەکات دەکوژرێت و بە کافری دەمرێت[2]؛ ئەوە بۆچوونی لیژنەی هەمیشەی فەتوایە[3]، و بۆچوونی ئیبن عوسەیمین و ئەلبانی و عبدالمحسن عەبادە بۆ ئەوانەی دەزانن و نکولی دەکەن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ٢٧﴾(إِبْرَاهِيم).

واتە: خوا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە جێگیریان دەکات لەسەر گوتەی جێگیر ویتەو کە گەواهیدانی "لا إله إلا الله محمد رسول الله"یە لە ژیانی دونیا و لە گۆڕیشدا، خوا ستەمکاران گومڕا دەکات و خوا ویستی لەسەر هەرچی هەبێت ئەنجامی دەدات.

---

(١). (شرح زاد المستقنع)(١/١٢٨٠).
(٢). (فتاوى نور على الدرب)(٣١٤/٤).
(٣). (فتاوى اللجنة الدائمة-١)(١٩/٥).

بوخاری و مسلم لە بەرائی کوڕی عازبەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ﴾ دەربارەی سزای گۆڕ دابەزیوە، پێی دەگوترێت: کێ پەروەردگارتە؟ دەڵێت: پەروەردگارم خوایە ﷻ و ئاینم ئایینی محمدە ﷺ، ئەمە ئەو جێگیر کردنەیە کە دەفەرموێت: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ﴾؛ ولە ڕیوایەتێکی تری بوخاریدا دەفەرموێت: باوەڕدار ئەگەر لە گۆڕدا پرسیاری لێکرا: گەواهیدەدات: "لاَ إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ" ئەمەش ئەو فەرموودەی خوایە ﷻ کە دەفەرموێت: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأَخِرَةِ﴾؛ سەعدی دەڵێت: خوا ﷻ بەندە باوەڕدارەکانی جێگیر و دامەزراو دەکات، کە لە دڵیاندا باوەڕیان هێناوە و کردەوەیان بە ئەندامەکانی لەشیان ئەنجامداوە، خوا ﷻ لە ژیانی دونیادا دامەزراویان دەکات لە کاتی هاتنی گومانەکان و هیدایەتیان دەدات و دڵنیاییان پێ دەبەخشێت و لە کاتی هاتنی ئارەزووەکان زاڵیان دەکات



بەسەر حەز و نەفسیاندا، لە سەرەمەرگیشدا لەسەر ئایینی ئیسلام و کۆتایی باش جێگیریان دەکات، لە گۆڕیشدا هیدایەتیان دەدات بۆ وەڵامدانەوەی دوو فریشتەکە و دەڵێت: خوا پەروەردگارمە، ئیسلام ئایینمە و محمد ﷺ پێغەمبەرمە، ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ﴾ خوا ﷻ ستەمکاران لە ڕاستی گومڕا دەکات لە دونیا و دواڕۆژدا، و خوا ﷻ ستەمی لێ نەکردوون بەڵکو خۆیان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردووە، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە لە گۆڕدا سزا و نازونیعمەت هەیە[1]؛ تەبەری دەڵێت: مانای ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ باوەڕداران جێگیر و دامەزراو دەکات لە ژیانی دونیادا لەسەر باوەڕ بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، ﴿وَفِي ٱلْأٓخِرَةِۖ﴾ بە هەمان ئەو شێوەی لە ژیانی دونیا کاتێك لە گۆڕەکانیان پرسیاریان لێ دەکرێت، بە جێگیری لەسەر باوەڕەکەیان وەڵامی فریشتەکان دەدەنەوە[2].

---

(١). (تفسير الكريم الرحمن)(٤٢٥/١).
(٢). (جامع البيان)(٦٠٢/١٦).

مسلم لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَوْلا أنْ لا تَدافَنُوا لَدَعَوْتُ اللهَ أنْ يُسْمِعَكُمْ مِن عَذابِ القَبْرِ)).

واتە: ئەگەر لە ترسی ئەوە نەبووایە بمرن، داوام لە خوا دەکرد، سزای گۆڕ ببیستن.

بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی بوخارییە دەڵێت: ((كانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو ويَقُولُ: اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن عَذابِ القَبْرِ، ومِن عَذابِ النّارِ، ومِن فِتْنَةِ المَحْيا والمَماتِ، ومِن فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجّالِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەپاڕایەوە دەیفەرموو: پەروەردگارا من پەنات پێ دەگرم لە سزای گۆڕ و لە سزای ئاگر و لە فیتنەی ژیان و مردن و لە فیتنەی مەسیحی دەجال.

و ترمزی و ئیبن حبان لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ

دەفەرموێت: ((إذا قُبِرَ الميَّتُ، أتاهُ ملَكانِ أسودانِ أزرقان، يقالُ لأحدِهِما: المنكرُ، وللآخرِ: النَّكيرُ..)).

واتە: ئەگەر مردوو لە گۆڕدا نێژرا، دوو فریشتە دێن بۆ لای، کە ڕەشن و چاویان شینە، بە یەکێکیان دەگوترێت مونکەر و بەئەوەی تریان نەکیر.

ئەلبانی: دەڵێت: پرسیاری ناوگۆڕ متەواترە، جگە لە ناوی فریشتەکان بە مونکەر و نەکیر کە فەرموودەیەك دەربارەی هاتووە سەنەدەکەی حەسەنە، لە (الصحيحة) بە ژمارە(١٣٩١)[1].

---

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)( ٨٤-٨٥).

## پێغەمبەران و پیاوچاكان شەفاعەت دەكەن

**(وَالْإِيمَان بشفاعة النَّبِي ﷺ، وبقوم يخرجُون من النَّار بَعْدَمَا احترقوا وصاروا فحما، فَيُؤْمَر بهم إِلَى نهر على بَاب الْجنَّة كَمَا جَاءَ الْأَثر كَيفَ شَاءَ الله وكما شَاءَ إِنَّمَا هُوَ الْإِيمَان بِهِ والتصديق بِهِ).**

**واته: و باوەڕبوون بە شەفاعەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، و كەسانێك لە ئاگر دەردەچن دوای سووتاون و بوون بە خەڵوز، فەرمان دەكرێت دەبرێن بۆ لای ڕووبارێك لەبەر دەرگای بەهەشت، وەك چۆن لە فەرموودەدا هاتووە، چۆن خوا ﷻ بیەوێت و بەوشێوەیەی دەیەوێت، دەبێت باوەڕمان پێی هەبێت و بە ڕاستی بزانین.**

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا ١٠٩﴾(طه).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەت و تكاكاری لای خوا سودی نابێت بۆ ئەو كەسە نەبێت كە خوای میهرەبان ڕوخسەتی دەدات و لە گوفتاری ڕازییە.

بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لِكُلِّ نَبِيّ دَعْوَةٌ مُسْتَجابَةٌ يَدْعُو بِها، وأُرِيدُ أنْ أخْتَبِئَ دَعْوَتِي شَفاعَةً لِأُمَّتِي فِي الآخِرَةِ)).

واتە: هەموو پێغەمبەرێك پاڕانەوەیەکی وەڵامدراوەی هەیە، پێی دەپاڕێتەوە، و من دەمەوێت پاڕانەوەکەم بهێڵمەوە بیکەم بە شەفاعەت بۆ ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا.

ئەلبانی دەڵێت: فەرموودە لەسەر بابەتی شەفاعەت متەواترە، ئیبن ئەبوعاصم لە سوننەدا شەش بابەتی لەسەر نوسیوە[١].

عوبێد جابری دەڵێت: شەفاعەت لە زماندا لە (الشفع) هاتووە، کە بریتییە لە کۆبوونەوە و دانەپاڵی دوو کەس یان زیاتر، کەسێك دەچێتە پاڵ کەسێکی تر...، ئەو کەسەش شەفاعەت دەکات دەچێتە پاڵ ئەو کەسەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت و دەبنە جووت.

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٣٧).

و له عورفدا: ویستی چاکەیە بۆ کەسانی تر، و دەتوانیت بلێیت: داواکردنی چاکەیە بۆ کەسانی تر.

و له شەرعدا: داواکردنی کەسێکە خوا ڕازییە لە گوفتار و کرداری، بۆ لێخۆشبوونی کەسانی تاوانبار(١).

تکاکاری و شەفاعەت ئەگەر خوا ئیزنی پێنەدات کەس ناتوانێت شەفاعەتی بۆ بکات، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەو دەقانەی کە بەڵگەن شەفاعەت کردن لە قیامەتدا هەیە بە سێ مەرجە: ڕەزامەندی خوا لە شەفاعەتکار، ڕەزامەندی خوا لە شەفاعەت بۆ کراو، ڕوخسەتدانی خوا بە شەفاعەت کردن(٢).

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ٢٨﴾

(١). بڕوانە: (التقرير الأحمد بشرح السنة للإمام أحمد)(٩٤).
(٢). (مجموع الفتاوى)(٢/٤٥).

واتە: خوا زانایە بە هەموو کردارەکانی پێشوو و ئایندەیان، و شەفاعەت و تکاکاری ناکەن بۆ کەسێك نەبێت کە خوا لێی ڕازییە، و زۆر لە پەروەردگاریان دەترسن و سەرپێچی فەرمانی ناکەن.

تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ﴿إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾ ئەو کەسانەیە کە خوا لە گەواهیدانی (لا إلَهَ إلّا اللَّهُ)یان ڕازییە.

و حاکم لە جابرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە و بە صەحیحی داناوە و زەهەبی هاوڕایەتی، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ﴾، و فەرمووی: شەفاعەت و تکاکاریم بۆ خاوەن تاوانە گەورەکانی ئوممەتەکەمە.

و ئەحمەد نەجمی دەڵێت: شەفاعەت دەبێتە حەوت بەشەوە، سیانیان تایبەتە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، و چواریان گشتییە:

یەکەم: شەفاعەت بۆ دەست پێکردنی قەزاوەت لە نێوان بەندەکاندا، کە (المقام المحمودة)، کە هەموو پێغەمبەرانی (أولوا العزم) کە ئەو

داوایەیان لێ دەکرێت ڕەتی دەکەنەوە، کە کۆتایان پێغەمبەرمانە ﷺ دەفەرموێت: ((أنا لَها، أنا لَها)).

دووەم: شەفاعەت بۆ کردنەوەی دەرگای بەهەشت ئەمەش تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

سێیەم: شەفاعەت بۆ ئەبوتالب، کە شەفاعەتکردنە بۆ سوکردنی سزا لەسەر سزادراو، ئەمە بۆ کەس نییە جگە لە ئەبوتالب[(١)].

(١). ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەبوتالب فەزڵی هەیە لەسەر ئیسلام، لەبەر ئەوەی دیفاعی لێکردووە، لەبەر ئەوە خودا ﷻ ڕوخسەتیداوە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ شەفاعەتی بۆ بکات، ئەگەرچی بۆ جگە لە ئەو ناشێت لە بێباوەڕان شەفاعەت بکات، لەبەر ئەو فەزڵەی هەیەتی بەسەر ئیسلامەوە لە پاراستنی پێغەمبەری خودا ﷺ و دیفاع لێکردنی، بەڵام ئەم شەفاعەتە سودی پێنەگەیاندووە سودێکی کامڵ، لەبەر ئەوەی باوەڕدار نەبوو، تەنها ئەوەندە سودی پێگەیاندووە کە: دوو نەعلی ئاگرینی لە پێدایە مێشکی بە هۆیانەوە دەکوڵێت، لە کاتێکدا وادەبینێت لە هەمووان سزای سەختترە بەڵام ئاسانترین سزای هەیە، و پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر من نەبوومایە لە پلەکانی خوارەوە ئاگری دۆزەخدا دەبوو. بڕوانە: (مجموع الفتاوی)(١٤٧/١٤).

جۆرەکانی تری شەفاعەت پێغەمبەرانی تر هاوبەشن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕاستگۆکان و شەهیدەکان و هەموو باوەڕدارانی تر، کە بریتین لە:

یەکەم: شەفاعەتکردن بۆ کەسانێك کە شایستەی سزادانن بە هۆی ئەو تاوانانەی ئەنجامیانداوە، شەفاعەتیان بۆ دەکرێت بۆ ئەوەی سزا نەدرێن بچنە بەهەشتەوە بەبێ سزادان.

دووەم: شەفاعەتکردن بۆ کەسانێك کە خراونەتە دۆزەخەوە بە هۆی ئەو تاوانانەی کە ئەنجامیانداوە، شەفاعەتکاران شەفاعەتیان بۆ دەکەن بۆ ئەوەی لە دۆزەخ دەریان بکەن و بیانخەنە بەهەشتەوە[(١)].

(١). ڕەبیع مەدخەلی دەڵێت: خودا ﷻ یەکخواپەرستان لە ئاگردا دەردەکات، بە هۆی ئەو باوەڕەیان هەیانە، ئەم شەفاعەتە خەوارج و ڕەوافز و جگە لەوانیش لە گومڕاکان نکوڵی دەکەن، کە جێگیرە بە قورئان و سوننەت: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ ﴿٢٨﴾﴾(الأَنبيَاء)، واتە: شەفاعەت و تکاکاری ناکەن بۆ کەسێك نەبێت کە خودا لێی ڕازییە؛ و لێرە دەستیان گرتووە بە کۆمەڵە دەقێکی گشتییەوە کە بێباوەڕان دەگرێتەوە و مەبەست باوەڕداران نییە، خودا ﷻ دەفەرموێت: ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ﴿٢٥٤﴾﴾(البَقَرَة)، واتە: پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە ڕۆژی قیامەتە و کڕین و فرۆشتن و خۆشەویستی و شەفاعەتی تێدا نییە.(شرح أصول السنه)(٦٥-٦٦).

سێیەم: شەفاعەتکردن بۆ کەسانێك شایانی پلەی خوارەوەن لە بەهەشتدا، شەفاعەتیان بۆ دەکرێت پلەیان بەرز بکرێتەوە زیاتر لەوەی شایستەین وەك فەزڵێك لە خواوە ﷻ.

چوارەم: شەفاعەتکردن بۆ ئەو کەسانەی ئەهلی ئەعرافن، و چاکەو خراپەکانیان یەکسانە، چاکەکانیان ڕێگرن بچنە دۆزەخەوە، و خراپەکانیان ڕێگرن بچنە بەهەشتەوە، شەفاعەتیان بۆ دەکرێت بۆ ئەوەی خوا لێیان خۆش بێت و بیانخاتە بەهەشتەوە، و هەموو ئەو جۆرانە جێگیرن بە فەرموودەی صەحیح دەگاتە ئاستی متەواتر[1].

(١). (شرح أصول السنة)(٩٦-٩٧).

## مەسیحی دەجال دەردەچێت

**(وَالْإِيمَان أَن الْمَسِيح الدَّجَّال خَارج مَكْتُوب بَين عَيْنَيْهِ كَافِر، وَالْأَحَادِيث الَّتِي جَاءَت فِيهِ وَالْإِيمَان بِأَن ذَلِك كَائِن).**

**واتە: و باوەڕبوون بەوەی کە مەسیحی دەجال لە کۆتایی دونیادا دەردەچێت، و لە نێوچاوانی نوسراوە کافر، و باوەڕبوون بەو فەرموودانەی سەبارەت بەوباسە هاتووە و ڕوودەدات وەك باسکراوە.**

دەرچوونی دەجال یەکێکە لە نیشانەکانی نزیکبوونەی بەرپابوونی قیامەت، و پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو نوێژێکدا پێش سەلامدانەوە پەنای بە خوا دەگرت لە شەڕی مەسحی دەجال، و فەرموودە لەسەر دەرچوونی متواترە، حمود التویجری دەڵێت: دەرچوونی دەجال زیاتر لە سەد و نەوەد فەرموودەی حەسەن و صەحیحی لەبارەوە هاتووە، و فەرموودەکانی لە زۆر ڕووەوە متەواترن، ئەگەر تەنها ئەو فەرموودەیەی لەبارەوە بهاتایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە پەنا بە خوا بگیرێت لە هەموو نوێژێکدا بەس بوو بۆ سەلماندنی دەرچوونی، و ڕەد بێت بۆ ئەوانەی نکولی دەکەن، عبدالرزاق بە سەنەدێکی حەسەن لە ئیبن

عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطّابِ رضي الله عنه وهُوَ يَقُولُ: إنَّهُ سَيَخْرُجُ بَعْدَكُمْ قَوْمٌ يُكَذِّبُونَ بِالرَّجْمِ، ويُكَذِّبُونَ بِالدَّجّالِ، ويُكَذِّبُونَ بِالحَوْضِ، ويُكَذِّبُونَ بِعَذابِ القَبْرِ، ويُكَذِّبُونَ بِقَوْمٍ يَخْرُجُونَ مِنَ النّارِ).

واتە: گوێم لە عومەری کوڕی خەتاب بوو رضي الله عنه دەیگوت: کەسانێك دوای ئێوە پەیدا دەبن ڕەجم، دەرچوونی دەجال، حەوز، سزای گۆڕ، و دەرچوونی کەسانێك لە ئاگر بە درۆ دەزانن.

ئەم ئەسەرە حوکمی ئەوەی هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو‌بێتی، چونکە باسی پەنهانی (غیب) تێدایە، ئەوەش بە ڕەئی ناگوترێت بەڵکو لە پێغەمبەری خواوەیە ﷺ[1].

ئەحمەد و ئەبوداود لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن سَمِعَ بالدَّجالِ فلينْأَ منه، مَن سَمِعَ بالدَّجّالِ فلينْأَ منه، مَن سَمِعَ بالدَّجّالِ فلينْأَ منه، فإنّ الرَّجُلَ

---

(١). بڕوانە: (إقامة البرهان)(٦).



يَأتيه وهو يَحسَبُ أنّه مؤمنٌ، فلا يَزالُ به لِما معه مِن الشُّبَهِ حتى يَتبَعَه)).

واتە: هەرکەسێك بیستی دەجال دەرچوو لێی دووركەوێتەوە چەندە دەتوانێت، دوو جار ئەمەی فەرموو، چونكە كەسێك دێت بۆ لای واگومان دەبات باوەڕدارە، بەوشێوەیە لەگەڵیدا دەبێت هەتاكو شوێنی دەكەوێت لەبەر ئەو گومانانەی پێیەتی.

بوخاری و مسلم لە ئەنەسی كوڕی مالكەوە ﵁ ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ما مِن نَبيٍّ إلّا وقَدْ أنْذَرَ أُمَّتَهُ الأعْوَرَ الكَذّابَ، ألا إنَّهُ أعْوَرُ، وإنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأعْوَرَ، ومَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ: ك ف ر)).

واتە: هیچ پێغەمبەرێك نییە ئیللا ئوممەتەكەی ئاگاداركردووەتەوە لە دەجال كە یەك چاوی كوێرە، پەروەردگاری ئێوە چاوێكی كوێر نییە، لە نێو چاوانی دەجال نوسراوە (ك،ف،ر).

ئیبن حبان لە عبداللەی كوڕی مغەفەلەوە ﵁ ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صحیح لغیرە داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ



دەفەرموێت: ((إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ نَبِيٌّ إِلّا حَذَّرَ أُمْتَهُ الدَّجّال وإِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ وإنه كائِنٌ فيكم)).

واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە ئیللا ئوممەتەكەی ئاگادار كردووەتەوە لە دەجال، من ئێوە ئاگادار دەكەمەوە و بێگومان لە نێو ئێوەدا دەردەچێت.

و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ثَلاثٌ إذا خَرَجْنَ لا يَنْفَعُ نَفْسًا إيمانُها لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ، أوْ كَسَبَتْ فِي إيمانِها خَيْرًا: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِن مَغْرِبِها، والدَّجّالُ، ودابَّةُ الأرْضِ)).

واتە: سێ شت هەیە ئەگەر سەریان هەڵدا هیچ كەسێك باوەڕ هێنان سودی پێ ناگەیەنێت ئەگەر پێش ئەو شتانە باوەڕی نەهێنابێت، یان ئەگەر باوەڕداریش بێت و كردەوەی باشی ئەنجام نەدابێت دوای ئەوە كردەوە سودی پێ ناگەیەنێت: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، هاتنی دەجال، و دەركەوتنی گیانلەبەری زەوی (دابة الأرض).

و مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە ﵄ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَخْرُجُ الدَّجّالُ فِي أُمَّتِي فَيَمْكُثُ أرْبَعِينَ - لا أدْرِي: أرْبَعِينَ يَوْمًا، أوْ أرْبَعِينَ شَهْرًا، أوْ أرْبَعِينَ عامًا فَيَبْعَثُ اللَّهُ عِيسى ابْنَ مَرْيَمَ كَأنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ، ثُمَّ يَمْكُثُ النّاسُ سَبْعَ سِنِينَ، لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَداوَةٌ، ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ رِيحًا بارِدَةً مِن قِبَلِ الشَّأْمِ، فَلا يَبْقى عَلى وجْهِ الأرْضِ أحَدٌ فِي قَلْبِهِ مِثْقالُ ذَرَّةٍ مِن خَيْرٍ أوْ إيمانٍ إلّا قَبَضَتْهُ، حَتّى لَوْ أنَّ أحَدَكُمْ دَخَلَ فِي كَبِدِ جَبَلٍ لَدَخَلَتْهُ عَلَيْهِ، حَتّى تَقْبِضَهُ)).

واتە: دەجال لە ئوممەتەکەی من دەردەچێت چل ڕۆژ یان چل ساڵ یان چل مانگ یان چل شەو لە نێویاندا دەمێنێتەوە، خوا ﷻ عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێت شێوەی وەك عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفییە بە دوای دەجالدا دەگەڕێت و خوا لەناوی دەبات، دوای دەجال خەڵك حەوت ساڵ دەمێننەوە لە نێوان دوو کەسدا دوژمنایەتی نییە، دوای ئەوە خوا هەوایەکی سارد لە لای شامەوە دەنێرێت هەرکەسێك کێشی مێرولەیەکی بچووك خێر یان باوەڕ لە دڵیدابێت ڕۆحی دەکێشێت، هەتاکو ئەگەر کەسێك لە ئێوە بچێتە نێو جەرگەی شاخێکیشەوە دەچێت ڕۆحی دەکێشێت.



و مسلم لە ئەبودەردائەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن حَفِظَ عَشْرَ آياتٍ مِن أوَّلِ سُورَةِ الكَهْفِ عُصِمَ مِنَ الدَّجّالِ)).

واتە: هەرکەسێك دە ئایەتی سەرەتای سورەتی الکهف لەبەر بکات پارێزراو دەبێت لە فیتنەی دەجال.

دیسان مسلم لە نەواسی کوڕی سەمعانەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فَمَن أدْرَكَهُ مِنكُمْ، فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَواتِحَ سُورَةِ الكَهْفِ)).

هەرکەسێك لە ئێوە گەیشت بە دەجال با سەرەتای سورەتی الکهفی بەسەردا بخوێنێت.

## پێغەمبەر عیسا ﷵ دادەبەزێت دەجال دەکوژێت

**(وأَن عِيسَى ابْن مَرْيَم ﷵ ينزل فيقتله بِبَاب لُدّ).**

**واته: و پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم ﷵ دادەبەزێت و له (باب لد[1]) دەیکوژێت.**

بوخاری و مسلم له ئەبوهورەیرەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((والَّذِي نَفْسِي بيَدِهِ، لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابنُ مَرْيَمَ حَكَماً عَدْلاً، فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلَ الخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ المالُ حتّى لا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ، حتّى تَكُونَ السَّجْدَةُ الواحِدَةُ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيا وَما فِيها))، (ثُمَّ يقولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: واقْرَؤُوا إنْ شِئْتُمْ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾(النِّسَاء).

---

(١). شارێکه له نزيك بيت المقدس له فەلەستین.

واتە: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە نزیکە پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم ﷺ دابەزێتە نێوتان کە حاکمێکی دادگەرە، خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت، سەرانە لادەبات و سامان ئەوەندە زۆر دەبێت کەس وەریناگرێت، سوژدەبردنێك بۆ خوا لەو کاتەدا باشترە لە دونیا و لەوەشی لەسەرییەتی، پاشان ئەبوهورەیرە ﵁ گوتی: حەزدەکەن ئەو ئایەتە بخوێننەوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێت: بێگومان کەس نییە لە خاوەن کتێبەکان باوەڕی پێنەهێنێت پێش ئەوەی وەفات بکات، و لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە گەواهیدەر بەسەریانەوە.

ئەلبانی دەڵێت: فەرموودە لەسەر دابەزینی عیسا ﷺ متەواترە و زۆرێك لە حافزە لێهاتووەکان گەواهی ئەوەیان داوە[١].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾(النِّسَاء).

---

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص١٠٧).

واتە: بێگومان کەس نییە لە خاوەن کتێبەکان باوەڕی پێنەهێنێت پێش ئەوەی وەفات بکات، و لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێتە گەواهیدەر بەسەریانەوە.

تەبەری دەڵێت: ڕاڤەکارانی قورئان ناکۆکن لە بارەی لێکدانەوەی ئەم ئایەتەوە، هەندێکیان دەڵێن: ﴿وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ﴾، مانای ئەوەیە: خاوەن کتێبەکان باوەڕ بە پێغەمبەر عیسا عليه السلام دەهێنن پێش ئەوەی وەفات بکات، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی هەموویان باوەڕی پێدەهێنن ئەگەر دابەزی و دەجالی کوشت، هەموو ئاینەکان دەبێتە یەك ئاین، ئەویش ئاینی ئیسلامە کە ئاینی یەکخواپەرستییە و دوور لە هاوبەش بڕیاردانە، کە ئاینی ئیبراهیمە عليه السلام[1].

مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ریوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ((والَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَيُهِلَّنَّ ابْنُ مَرْيَمَ بِفَجِّ الرَّوْحاءِ، حاجًّا أوْ مُعْتَمِرًا، أوْ لَيَثْنِيَنَّهُما)).

---

(١). (جامع البيان)(٩/٣٨٠).

واتە: عیسای کوڕی مەریەم ﷺ تەلبیە دەکات "لبیك اللهم لبیك" لە ڕەوحائەوە[1] بۆ حەج یان بۆ عومرە، یان بۆ حەج وعومرە پێکەوە.

و بوخاری ومسلم لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((كَيْفَ أَنْتُمْ إذا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ، وإمامُكُمْ مِنكُمْ)).

واتە: حاڵتان چۆنە کە عیسای کوڕی مەریەم ﷺ دادەبەزێت، کەسێك لە ئێوە پێش نوێژی بۆ دەکات.

و ئەحمەد و ئەبوداود لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((ليس بَيني وبينه نَبِيٌ وإنّه نازلٌ، فإذا رأَيْتُموه فاعْرِفوه: رجُلٌ مربوعٌ، إلى الحُمْرةِ والبَياضِ، بين ممصَّرتَيْنِ، كأنّ رأسَهُ يقطُرُ، وإنْ لم يُصِبْهُ بَلَلٌ، فيقاتِلُ النّاسَ على الإسلامِ، فيدُقُّ الصَّليبَ، ويقتُلُ الخِنْزيرَ، ويضَعُ الجِزْيةَ، ويُهلِكُ اللهُ في زمانِهِ المِلَلَ كلَّها، إلّا الإسلامَ،

---

(١). شوێنێکە لە نێوان مەکە و مەدینە.



ويُهلِكُ المسيحَ الدَّجّالَ، فيمكُثُ في الأرضِ أربعين سَنَةً، ثمَّ يُتوفّى، فيُصلِّي عليه المُسلِمونَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە نێوان من و عیسادا ﷺ پێغەمبەر نەهاتووە، و دادەبەزێتە سەر زەوی، ئەگەر بینیتان بیناسنەوە: پیاوێکە بالآی مام ناوەندە، ڕەنگی پێستی سور وسپییە، دوو پۆشاکی لەبەردایە ڕەنگیان مەیلە و زەردە، سەری خەریکە ئاوی لێ بچۆڕێت ئەگەرچی تەڕیش نەکراوە، شەڕ دەکات لەگەڵ خەڵکدا بۆ ئەوەی موسڵمانبن، خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت، و سەرانە لادەبات، و خوا لە سەردەمی ئەودا هەموو ئاینەکانی تر لە ناو دەبات جگە لە ئیسلام، و مەسیحی دەجالیش دەکوژێت، لەسەر زەویدا چل ساڵ دەمێنێتەوە، پاشان دەمرێت و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

و مسلم لە نەواسی کوڕی سەمعانەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((يَنْزِلُ عِنْدَ المَنارَةِ البَيْضاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ....فَيَطْلُبُهُ حَتّى يُدْرِكَهُ بِبابِ لُدٍّ، فَيَقْتُلُهُ)).



واتە: پێغەمبەر عیسا ﵇ لە ڕۆژهەڵاتی دیمەشق لای مەنارە سپییەکە دادەبەزێت، شوێنی دەجال دەکەوێت هەتاکو لە بابی لود پێی دەگات و دەیکوژێت.

ئەمانە و چەندان فەرموودەی تر هەن بەڵگەن کە عیسای کوڕی مەریەم ﵇ لە کۆتاییەکانی دونیا دادەبەزێت و پەیڕەوی لە ئاینی ئیسلام دەکات و خۆشگوزەرانی و ئاسودەیی بەرقەرار دەکات و دەجال دەکوژێت.

## باوەڕ گوفتار و کردارە و کەم و زیاد دەکات

**(وَالْإِيمَان قَول وَعمل يزِيد وَينْقص كَمَا جَاءَ فِي الْخَبَر:** ((أكمل الْمُؤمنِينَ إِيمَانًا أحْسنهم خلقا[١])).

**واتە: باوەڕ گوفتار و کردارە و زیاد و کەم دەکات، وەك لەم فەرمووده‌یەدا هاتووە: کاملترین باوەڕی باوەڕداران ئەوانەن کە باشترین ڕەوشتیان هەیە.**

ئەم بڕگەیەی ئیمام ئەحمەد ڕەدە لەسەر مورجئەکان کە دەڵێن: باوەڕ تەنها بە ڕاست زانینی دڵە، و مورجیئەی فوقەها کە دەڵێن: باوەڕ بە ڕاستزانینی دڵ و گوفتاری زمانە، کردار لە مانای باوەڕ دەردەکەن، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢﴾(الأنفال).

(١). أخرجه أبوداود و الترمذي، قال: الألباني: حسن صحيح.



واتە: باوەڕدارانی ڕاستەقینە ئەو کەسانەن کە ئەگەر ناوی خوا هێنرا دڵیان زۆر دەترسێت، و ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێندرێتەوە باوەڕیان زیاد دەکات، و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن و ئومێدیان بە کەسی تر نییە.

ئیبن کەسیر دەڵێت: بوخاری و پێشەواکانی تر ئەم ئایەتە و هاوشێوەکانی دەکەنە بەڵگە بۆ زیادبوونی باوەڕ و جیاوازی لە دڵەکاندا، کە ئەوە مەزهەبی جمهوری ئوممەتە، بەڵکو زیاتر لە پێشەوایەك کۆدەنگی زانایانیان لەو بارەیەوە گێڕاوەتەوە، وەك شافعی و ئەحمەد وئەبوعوبید[1]؛ و هەر شتێك زیاد بکات دەشێت کەمیش بکات، ئەمەش وەڵام و بەرپەرچی بۆچوونی مورجیئەکانە کە دەڵێن: باوەڕ زیاد و کەم ناکات، و هەندێکیان دەڵێن: باوەڕمان وەك باوەڕی جبریلە عليه السلام؟!.

---

(١). (تفسير القرآن العظيم)(١١/٤).

و خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ١٢٤﴾(التَّوۡبَة).

واتە: هەرکاتێك سورەتێك دابەزێنرا کەسانی وایان هەبوو دەیگوت: کێ بەم سورەتە باوەڕی زیاتر و پتەوتر بوو، بێگومان ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێنابوو، باوەڕیان زیاتر و پتەوتر دەبوو، و مژدەیان بە یەکتر دەدا.

و دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ٢٢﴾(الأَحۡزَاب).

واتە: کاتێك باوەڕداران قورەیش و هاوپەیمانەکانیان بینی، گوتیان: ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی پێیاندابن، و هەموو بەڵێنەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستن جێبەجێ دەبن، و بینینی

هاوبەش بڕیاردەران کەبە گەلەکۆمە هاتوونەتە سەریان باوەڕ و ملکەچییانی بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی زیاتر کرد.

ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا﴾ بەڵگەیە لەسەر زیادکردنی باوەڕ و بەهێزی بە نیسبەت حاڵی خەڵکەوە، و ئەوە قسەی جمهوری پێشەواکانە: کە باوەڕ زیاد وکەم دەکات[1]؛ وشەنقیتی دەڵێت: ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا﴾ ڕاشکاوە کە باوەڕ زیاد دەکات، و لە چەند ئایەتێکدا لە قورئان خوا ﷻ بە ڕاشکاوی ئەوەی باسکردووە، بۆیە ناکۆکی بواری نییە، وەك ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿لِيَزْدَادُوٓاْ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ ٤﴾(الفَتْح)، وئەوەی دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا ١٢٤﴾(التَّوْبَة)[2].

و دەفەرموێت: ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًى ۗ ٧٦﴾(مَرْيَم).

---

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٦/٣٩٢).
(٢). (أضواء البيان)(٦/٢٣٥).

واتە: ئەو کەسانەی هیدایەتیان وەرگرتووە و باوەڕیان هێناوە خوا هیدایەتیان زیاتر دەکات.

و دەفەرمووێت: ﴿وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنًا ٣١﴾(المُدَّثِّر).

واتە: بۆ ئەوەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە باوەڕیان زیاد بکات؛ ئەو بەڵگانە کە باسکران هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی باوەڕ زیاد دەکات.

و بوخاری ومسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت: ((لاَ يَزْنِي الزّانِي حِينَ يَزْنِي وهُوَ مُؤْمِنٌ، ولاَ يَسْرِقُ السّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وهُوَ مُؤْمِنٌ)).

واتە: زیناکار ئەو کاتەی زینا دەکات باوەڕداربێت زینا ناکات، و دز ئەو کاتەی دزی دەکات باوەڕداربێت دزی ناکات.

و ئەبوداود و ترمزی و ئیبن ماجە لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت: ((إذا زَنى الرَّجُلُ خَرَجَ مِنهُ الإيمانُ وكانَ عَلَيْهِ كالظُّلَّةِ فَإذا أقلع رَجَعَ إلَيْهِ الإيمانُ)).

واتە: ئەگەر بەندە زینای کرد باوەڕ لە لاشەی دەردەچێت، وەك سێبەر بەسەر سەریەوە دەوەستێت، ئەگەر لەو کردارە بوویەوە باوەڕەکەی بۆ دەگەڕێتەوە.

و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((مَن رَأى مِنكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسانِهِ، فَإنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وذَلِكَ أضْعَفُ الإيمانِ)).

واتە: هەرکەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی بە دەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی، ئەگەر نەیتوانی لە دڵەوە ئەو خراپەی پێناخۆش بێت، ئەمەش لاوازترین پلەی باوەڕە؛ و ئەم فەرموودانە بەڵگەن بە تاوان و خراپەکاری کەم دەکات و لاواز دەبێت.

و بەڵگە لەسەر ئەوەی باوەڕ کردارە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٤٣﴾(البَقَرَة).

واتە: خوای پەروەردگار ئەو نوێژانەی ڕووەو بیت المقدس ئەنجامتانداوە بە فیڕۆینادات و ونی ناکات، بە ڕاستی خوا بەرامبەر خەڵك زۆر میهرەبان و بە بەزەییە.

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە کردەوە لە باوەڕە چونکە نوێژی بە باوەڕ ناوبردووە، ترمزی لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: ((لَمّا وُجِّهَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم إلى الكَعْبَةِ قالُوا: يا رَسُولَ اللهِ كَيْفَ بِإخْوانِنا الَّذِينَ ماتُوا وهُمْ يُصَلُّونَ إلى بَيْتِ المَقْدِسِ؟ فَأنْزَلَ اللَّهُ تَعالى: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ ١٤٣﴾ الآيَةَ)).

واتە: کاتێك ڕووگەی نوێژی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گۆڕا بۆ کەعبە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو برایانەمان چارەنووسیان چییە کە مردن و نوێژیان ڕووەو بیت المقدس ئەنجام دابوو خوا سبحانه وتعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ ١٤٣﴾.

و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: ((الإيمانُ بِضْعٌ وسَبْعُونَ "أوْ بِضْعٌ وسِتُّونَ" شُعْبَةً، فَأفْضَلُها قَوْلُ لا إلَهَ إلّا اللَّهُ، وأدْناها إماطَةُ الأذى عَنِ الطَّرِيقِ، والحَياءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإيمانِ)).

واتە: باوەڕ حەفتا و ئەوەندە یان شەست و ئەوەندە بەشە،



باشترین بەشی گوتنی: لا إله إلا الله یە، و نزمترین بەشی لادانی ئازار و نارەحەتییە لەسەر ڕێگا، و شەرم بەشێکە لە باوەڕ.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لا إله إلا الله کە گوفتارە باشترین بەشی باوەڕە.

ڕەبیع مەدخەلی دەڵێت: باوەڕ گوفتار و کردارە، گوفتاری دڵ و زمانە، و کردەوەی دڵ و ئەندامەکانی لەشە، یان دەڵێت: باوەڕ گوفتار و کردار و بیروباوەڕە، بە گوێڕایەڵی زیاد دەکات، و بە سەرپێچی و تاوان کەم دەکات، ئەمە باوەڕە لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت[1].

عوبید جابری دەڵێت: گوفتار دووانە: گوفتاری دڵ و گوفتاری زمان:

گوفتاری زمان: بنەمای هەموو ئاین گوتنی هەردوو گەواهیدانەکەیە، مرۆڤ ئەگەر موسڵمان نەبێت جوولەکە بێت یان گاور یان لە بێباوەڕانی تربێت، موسڵمان نابێت بە دوو شاهیدییەکە نەبێت.

گوفتاری دڵ: بریتییە لە نییەت، و عەزیمەت بۆ ئەنجامدانی

(١). (شرح أصول السنة)(٧٣).

فەرمانەکان، و وازهێنان لە نەهی لێکراوەکان، ئەو بیروباوەڕە صەحیحەیە کە بە خوا ﷻ هەیەتی، و ئەوەی لە کتێبەکەیدا هاتووە، یان پێغەمبەرەکەی هێناویەتی، و سێ شت دەگرێتەوە:

یەکەم: باوەڕ بوون بە فەرمانەکان، و باوەڕبوون بە ئەنجامدانی.

دووەم: باوەڕبوون بە وازهێنان لە نەهیلێکراوەکان.

سێیەم: بە ڕاستزانینی هەواڵەکان.

بۆ نموونە: موسڵمان باوەڕی وابێت پێنج نوێژەکە لەسەری فەرزە، و ئەو پاداشتەی لەسەری هاتووە لای خوا ﷻ بە ڕاستی بزانێت، ئەمە گوتاری دڵە، هەروەها بیروباوەڕت بەوەی ئەم کردارە حەرامە لەسەرت یان مەکروهە، ئەمە گوتاری دڵتە.

و کرداریش دووانە، کرداری ئەندامەکانی لەش، وەك پێنج نوێژەکە، و زەکاتدان، و ڕۆژووی ڕەمەزان، و حەج و عومرە و جگە لەوانەش.

و کرداری دڵ: جووڵەیەتی بەرەو فەرمانەکان بۆ ئەنجامدانیان، و نەهیلێکراوەکان بۆ وازلێهێنانیان، نموونەی ئەوە: خۆشویستنی



موسڵمانە بۆ نوێژ، و عەزیمەتی بۆ ئەنجامدانی، ئەمە کرداری دڵە[١].

و عوبید جابری دەڵێت: کردەوە بە نیسبەت باوەڕەوە سێ بەشە:

یەکەم: بە وازلێهێنانی باوەڕی نامێنێت، کەسێك شایەتی نەدات کە تەنها خوا شایانی پەرستنە، و محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە بێباوەڕ دەبێت بە کۆڕای زانایان، و لەسەر ئەنجامنەدانی نوێژ ناکۆکن ئایا بێباوەڕ دەبێت یاننا.

دووەم: هەندێك کردەوە وازلێنانی لاڕێی و فاسقییە، کەماڵی باوەڕی واجب بە ئەنجامدانی کەم دەکات، وەك نەدانی زەکات، و ڕۆژوو نەگرتن، و حەج نەکردن، ئەم کەسە کافر ناکرێت ئەگەر لەبەر کەمتەرخەمی ئەنجامیان نەدات، بەڵام هەرکەسێك نکوڵی واجبوونیان بکات بە زانینەوە کافر دەبێت.

سێیەم: هەندێك کردەوە وازلێهێنانی خاوەنەکەی کەماڵی موستەحب باوەڕ بە دەست ناهێنێت، وەك ئەنجامنەدانی سوننەتەکان[٢].

---

(١). بڕوانە: (تكحيل العينين بشرح عقيدة الرازيين)(٤٩-٥٠).
(٢). بڕوانە: (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)(١٠٨-١٠٩).

## حوكمی ئەو كەسەی نوێژ ناكات

**(وَمن ترك الصَّلَاة فقد كفر، (**وَلَيْسَ من الْأَعْمَال شَيْء تَركه كفر إِلَّا الصَّلَاة)[١]**، من تَركهَا فَهُوَ كَافِر وَقد أحل الله قَتله).**

**واته: هەركەسێك واز لە نوێژكردن بهێنێت بێباوەڕە، و هیچ كردەوەیەك نییە وازلێ هێنانی كوفر بێت جگە لە نوێژ، هەركەسێك واز لە نوێژكردن بهێنێت ئەوە كافرە، و خوا كوشتنی حەڵاڵ كردووە.**

پرسی نوێژ نەكردن لەبەر كەمتەرخەمی و تەمبەڵی پرسێكە جێگای ناكۆكیە لای زانایان، ئیمام ئەحمەد لێرە بۆچوونی وایە كە كافرە، ئەو قسەی عبداللەی كوڕی شەققی هێناوە وەك ئەوەیە بڵێت: هاوەڵان هەموویان كۆڕان لەسەر ئەو پرسە، و كۆمەڵێك بەڵگە هاتووە كە ئەو مانایە دەگەیەنێت، لەوانە:

مسلم لە جابری كوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ((إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وبَيْنَ الشِّرْكِ والكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاةِ)).

---

(١). أخرجه الترمذي من قول عبدالله بن شقيق العقيلي، و صححه الألباني.

واتە: نێوان کەسێك و شیرك و کوفر وازهێنانە لە نوێژ؛ واتە: هەرکەسێك نوێژ نەکات کافر دەبێت.

بوخاری لە (الأدب المفرد) لە ئەبودەردائەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: ((أَوْصَانِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِتِسْعٍ: لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ شَيْئًا وَإِنْ قُطِّعْتَ أَوْ حُرِّقْتَ، وَلَا تَتْرُكَنَّ الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ مُتَعَمِّدًا؛ وَمَنْ تَرَكَهَا مُتَعَمِّدًا بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ...)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی بە نۆ شت پێکردم لەوانە: هیچ هاوبەش بۆ خوا دامەنێ ئەگەر پارچە پارچە کرایت یان سوتێنرایت، و نوێژی فەرز وازلێ مەهێنە و پشتگوێی مەخە بە ئەنقەست، ئەو کەسەی بە ئەنقەست نوێژی فەرز ئەنجام نەدات بێبەش دەبێت لە چاودێری و پاراستنی خوا...

و خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ ﴿١١﴾﴾(التَّوْبَة).

واتە: ئەگەر تەوبەیان کرد و وازیان لە هاوبەش بڕیاردان هێنا و موسڵمان بوون و نوێژەکانیان بەو شێوەیە ئەنجام دا کە فەرمانیان پێکراوە و زەکاتی سامانەکانیان دەرکرد، دەبنە براتان لە ئایندا.

بەڵام ئەگەر ئەم ئایەتە بەڵگەبێت لەسەر ئەوەی کەسێك نوێژ نەکات کافرە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەش کەسێك زەکاتی سامانی دەرنەکات کافرە.

و خوا ﷻ دەفەرمویت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ۝٥٩ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ۝٦٠﴾(مَرۡيَم).

واتە: دوای ئەو پێغەمبەرانە کەسانێك لە نەوەکانیان بوونە جێنشینیان، نوێژەکانیان فەوتاند و زایەیان کردن، و شوێن ئارەزووەکانیان کەوتن، لە ئایندەدا لە دۆزەخدا دوچاری سزا و ناڕەحەتی و بێئومێدی دەبن، جگە لەو کەسانەی تەوبە دەکەن و کردەوەی باش ئەنجام دەدەن، ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ ستەمێکیان لێناکرێت.

ئیبن کەسیر دەڵێت: زانایان ناکۆکن لە لێکدانەوەی: ﴿أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ لێرە، هەندێك دەڵێن: واز لێهێنانییەتی بە شێوەیەکی گشتی، ئەمە قسەی محمدی کوڕی کەعبی قورەزیی و ئیبن زەیدی کوڕی ئەسلەم، و سودییە، و ڕای پەسەندە لای تەبەری، لەبەر ئەوەیە کەسانێك لە سەلەف و خەلەف و پێشەوایان، و ئەوەی باوە لە پێشەوا ئەحمەدەوە، و گوتەیەکی شافعییە کە ئەو کەسەی واز لە نوێژ دەهێنێت کافرە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی کە دەفەرموێت: نێوانی بەندە و هاوبەش بڕیاردان وازهێنانە لە نوێژ، و ئەو فەرموودەی تر کە دەفەرموێت: ئەو بەڵێنەی لە نێوان ئێمە و ئەواندا هەیە نوێژە، هەرکەسێك وازی لێ بهێنێت بێباوەڕ دەبێت،....﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ جگە لەو کەسانەی کە پەشیمان دەبنەوە لە وازهێنان لە نوێژەکانیان وشوێنکەوتنی ئارەزووەکانیان، خوا تەوبەی ئەو کەسانە وەردەگرێت[1]؛ و ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٥/٢٤٣-٢٤٦).



وَءَامَنَ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کاتەی نوێژەکانی بە زایە دەدا و شوێن حەزوئارەزووەکانی کەوت باوەڕدار نەبوو[1].

لە بەرامبەردا کۆمەڵێك لە زانایان بۆچوونیان وایە کەسێك کە نوێژ ناکات لەبەر تەمبەڵی یان کەمتەرخەمی یان هەندێك لە نوێژەکانی ناکات و هەندێکی دەکات، یان ماوەیەك نوێژ دەکات و ماوەیەك وازی لێ دەهێنێت، تاوانێکی زۆر گەورەی ئەنجامداوە، بەڵام لە بازنەی ئیسلام دەریناکەن ئەگەر نکوڵی واجبوونی نەکات، و ئەم فەرموودانە دەکەنە بەڵگە:

ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی و ئیبن ماجە لە عوبادەی کوڕی صامتەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە ئەمە لەفزی ئیبن ماجەیە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خمسُ صلواتٍ افترضَهُنَّ اللَّهُ علَى عبادِهِ فمن جاءَ بِهِنَّ لم ينتقِصْ منهنَّ شيئًا استخفافًا بحقِّهنَّ فإنَّ اللَّهَ جاعلٌ لَه يومَ القيامةِ عَهْدًا أن يُدْخِلَهُ الجنَّةَ ومن جاءَ بِهِنَّ قدِ انتقَصَ منهنَّ

(١). (مجموع فتاوى ورسائل)(١٢/٤١).



شيئًا استخفافًا بحقِّهنَّ لم يَكُن لَه عندَ اللَّهِ عَهْدٌ إن شاءَ عذَّبَهُ وإن شاءَ غفرَ لَهُ)).

واتە: پێنج نوێژ خوا فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی، هەرکەسێك ئەنجامیان بدات، بەبێ کەموکورتی و لەبەر بە کەم سەیرکردنی لە دەستیان نەدات، ئەوە بێگومان خوا ﷻ بەڵێنێکی پێداوە لە ڕۆژی قیامەتدا بیخاتە بەهەشتەوە، و هەرکەسێك لە شتێکدا کەمتەرخەمی بکات و گرنگ نەبن بەلایەوە ئەو بەڵێنەی بۆ نییە، ئەگەر ویستی سزای دەدات و ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت.

دەڵێت: ((إن شاءَ عذَّبَهُ وإن شاءَ غفرَ لَهُ)) ئەگەر کەسێك بێباوەڕبێت خوا لێی خۆش نابێت، بەڵام هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەگەر نوێژ بە گشتی واز لێ بهێنێت کافر دەبێت نەوەك کەمتەرخەمی بکات و مافەکانی نوێژەکەی بە جوانی بەجێ نەهێنێت.

و بەزار لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ نَفَعَتْهُ يَوْمًا مِنْ دَهْرِهِ، يُصِيبُهُ قَبْلَ ذَلِكَ مَا أَصَابَهُ)).



واتە: هەرکەسێك بڵێت: لا إله إلا الله، ڕۆژێك لە تەمەنی سودی پێدەگەیەنێت، ئەگەر پێش ئەوە تووشی هەرچی ببێت.

و ئەحمەد لە ئیبن مەسعودەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: (كانَ رجلٌ ممَّن كان قبلكم لم يعمل خيرًا قطُّ؛ إلا التوحيد، فلما احتُضر قال لأهله: انظروا: إذا أنا متُّ أن يحرِّقوه حتى يدعوه حممًا، ثم اطحنوه، ثم اذروه في يوم ريح، [ثم اذروا نصفه في البر، ونصفه في البحر، فوالله؛ لئن قدر الله عليه ليعذبنه عذابًا لا يعذبه أحدًا من العالمين]، فلما مات فعلوا ذلك به، [فأمر الله البر فجمع ما فيه، وأمر البحر فجمع ما فيه]، فإذا هو [قائم] في قبضة الله، فقال الله ﷻ: يا ابن آدم! ما حملك على ما فعلت؟ قال: أي ربِّ! من مخافتك (وفي طريق آخر: من خشيتك وأنت أعلم)، قال: فغفر له بها، ولم يعمل خيرًا قطُّ إلا التوحيد).

واتە: کەسێك هەبوو لە ئوممەتەکانی پێش ئێوە هیچ کردەوەیەکی چاکی ئەنجام نەدابوو، تەنها تەوحیدی هەبوو، لەسەرە مەرگدا بە کەسوکاری گوت: ئەگەر مردم بمسوتێنن و لێمگەڕێن هەتاکو دەبمە خەڵوز، پاشان خەڵوزەکە بهاڕن، پاشان لە ڕۆژێکدا کە با بێت، نیوەی خەڵوزە هاڕاوەکە بدەن بە بادا، و نیوەکەی تری بکەنە دەریاوە، سوێند

بە خوا ئەگەر خوا توانی زیندووم بکاتەوە سزایەکم بدات کەس لە جن و مرۆڤ سزای وانەدات، کاتێك مرد بەوشێوەیان پێکرد، خوا ﷻ فەرمانی کرد بە وشکانی هەموو بەشەکانی کۆ کردەوە، و فەرمانی کرد بە دەریا هەموو بەشەکانی کۆ کردەوە، لە مشتی پەروەردگاردا خۆی بینییەوە، خوا ﷻ پێی فەرموو: ئەی نەوەی ئادەم، چی پاڵنەرت بوو، ئەوەت کرد؟ گوتی: بەڵێ، پەروەردگارا ترسی تر، و لە ڕیوایەتێکدا: ترسی تۆ، خۆت زانا تریت، خوا ﷻ بەوە لێی خۆش بوو، و هیچ کردەوەیەکی چاکی ئەنجام نەدابوو جگە لە تەوحید.

ئەلبانی لە سەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئەمە گوتەی ئیبن مەسعودە رضي الله عنه بەڵام حوکمی ئەوەی هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبێتی، پاشان دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی بەهێزی تێدایە کە کەسی موحد بە هەمیشەلە ئاگری دۆزەخدا نامێنێتەوە، کردەوە هەرچەند پێچەوانەبێت بۆ ئەوەی باوەڕ پێویستی دەکات لە کردار، وەك نوێژ و هاوەشێوەکانی لە بنەما کردارییەکان، ئەوەی کە ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە ئەوەیە بە متەواتری لە فەرموودەکانی شەفاعەتدا هاتووە، خوا فەرمان بە شەفاعەتکارەکان دەکات ئەو کەسانە لە ئاگری دۆزەخ

دەربهێنن کە کێشی مێرولەیەکی بچووك باوەڕ لە دڵیاندایە، ئەوەشی ئەمە دەسەلمێنێت ئەوەیە لە فەرموودەکەی ئەبوسەعیدی خودریدا ﷺ هاتووە: خوا ﷻ کەسانێك لە ئاگر دەردەکات کە هەرگیز کردەوەی باشیان ئەنجام نەداوە، کە بەڵگەی ڕاشکاوە لەسەر ئەوەی نوێژنەکەر کە باوەڕی بە واجبوونی هەبێت لە ئاگر دەردەکرێت، و بە هەمیشەی تێیدا نامێنێتەوە[1].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾(النِّسَاء).

واتە: بێگومان خوا خۆش نابێت لە هاوبەش بڕیاردان، و خۆش دەبێت لە هەر تاوانێك جگە لە هاوبەش دانان بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت، و هەرکەس هاوبەش بۆ خوا دابنێت بەڕاستی درۆ وتاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە.

(١). بروانە: (السلسلة الصحيحة)(٣٠٤٨)(١٠٥/٧).

زانایانی ئەهلی سوننەت ناکۆکن ئایا ئەو ڕەهاییەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە کەسی نوێژ نەکەریش دەگرێتەوە؟ جمهوری زانایان بۆچوونیان وایە کە کەسی نوێژنەکەر لەبەر تەمبەڵی، یان هەندێك جار نوێژەکانی ئەنجام بدات و هەندێك جار وازیان لێ بهێنێت، تاوانی گەورەی ئەنجامداوە بەڵام لە بازنەی ئیسلام دەری ناکەن ئەگەر باوەڕی بە واجب بوونی نوێژ هەبێت، ئیبن قەیم دەڵێت: موسڵمانان ناکۆکنین کە وازهێنان لە نوێژە فەرزەکان بە ئەنقەست لە تاوانە زۆر گەورەکانە، و تاوانی لە کوشتن و بردنی سامانی خەڵك و زینا و دزی و مەیخواردنەوە گەورەترە، و خاوەنەکەی شایستەی سزا و توڕەیی خوایە ﷻ و ڕیسوایە لە دونیا و دواڕۆژیش[1]؛ و وەڵامی هاوشێوەی ئەو فەرموودانەی داوەتەوە کە مسلم لە جابرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان لە نێوان مرۆڤ و نێوان شیرك و کوفردا ئەنجام نەدانی نوێژە؛ بەوەی کە ئەو کوفرەی باسکراوە کوفری بیروباوەڕ نییە هەتاکو نەسەلمێت کە لە ناخەوە باوەڕی بە ئەنجامدانی نوێژ نییە، و ئیبن تەیمییە دەڵێت: هەرکات کەسێك ئامادە نەبوو نوێژ بکات هەتا

(١). (الصلاة وأحكام تاركها)(٣١).



دەكوژرێت ئەوكەسە لە ناخدا باوەڕی بە واجبوونی نوێژ نییە، و ئەو كەسە كافرە بە كۆ دەنگی موسڵمانان[1]؛ و ئیبن قەیم دەڵێت: جێی سەرسوڕمانە گومان هەبێت لە بێباوەڕی ئەو كەسەی پێداگرە لەسەر ئەنجامنەدانی نوێژ، لە كاتێكدا بانگ بكرێت و بە پێش چاوییەوە بریسكەی شمشێر ببینێت و لەسەری بەرزكراوەتەوە، و كۆت و بەند كرابێت و چاوەكانی ببەسرێتەوە بۆ ئەوەی بكوژرێت، و پێی بگوترێت: نوێژ دەكەیت یان دەتكوژین، بڵێت: بمكوژن، هەرگیز نوێژ ناكەم[2]؛ و زەید مەدخەلی دەڵێت: جمهوری زانایان جیاوازی دەكەن لە نێوان ئەو كەسەی نوێژ ناكات و نكولی واجب بوونی دەكات ئەو كەسە بێباوەڕە بە كۆڕای زانایان، و ئەو كەسەی دان دەنێت بە واجب بوونی نوێژدا بەڵام كەمتەرخەم و تەمبەڵی دەكات و ئەنجامی نادات، دەڵێن: تاوانبار و فاسقە لە ئیسلام دەرنەچووە، بەڵام حاڵی ترسناكە، و بۆچوونیان وایە بەند بكرێت لە لایەن دەسەڵاتدارەوە و خۆراكی پێ بدرێت، و سێ ڕۆژ پێی بگوترێت تەوبە بكە، ئەگەر تەوبەی كرد لێی قەبوڵ دەكرێت،

---

(١) . (مجموع الفتاوى)(٢٢/٤٨).
(٢). (الصلاة وأحكام تاركها)(٦٣).

ئەگەر دوای ئەو سیٚ ڕۆژە تەوبەی نەکرد دەکوژرێت[1]؛ و ڕەبیع مەدخەلی دەڵێت: ئیمام ئەحمەد چەند قسەیەکی هەیە سەبارەت بە کافرکردنی ئەو کەسانەی بنەما کردارییەکان واز لیٚ دەهێنن، قسەیەکی هەیە تەنها نوێژنەکەر و ئەو کەسەی زەکات نادات بە کافر دادەنێت، و قسەیەکی هەیە تەنها نوێژنەکەر بە کافر دادەنێت، و قسەیەکی هەیە نوێژنەکەر بە کافر دانانێت، لەبەر ئەوەی شتەکان تێکەڵ و ترسناکن، و بەڵگەی هەردوولا بەهێزە، بۆیە مرۆڤ هەندێك ناکۆکی لە قسەکانی و ناکۆکی لە دیدگایدا دروست دەبێت، لای شافعی و مالك و ئەبوحەنیفە نوێژنەکەر کافر نییە.... و شافعی و ئەحمەد لە قسەیەکیدا و مالك و زۆرێك لە ئیمامەکان بە کافری نازانن ئیللا ئەگەر وازلێهێنانەکەی ئەوەبێت نکولی بکات، بەڵام کەسێك دانبنێت بە واجبوونی نوێژدا ناکۆکن لەبارەیەوە، هەندێکیان دەڵێن: دەکوژرێت، داوای تەوبەکردنی لیٚ دەکرێت ئەگەر نوێژی نیوەڕۆی نەکرد، پێی دەگوترێت: نوێژ بکە هەتاکو کاتی نوێژی عەسر نەهاتووە، ئەگەر ڕەتی کردەوە نوێژ بکات وەك حەدێك بۆ ئەو تاوانەی دەکوژرێت، و ئەو زانایانەی بە کافری

---

(١). (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)(١١٩).

دەزانن دەڵێن: دەکوژرێت لەبەر ئەوەی کافرە، وەك ئەو کەسانەی لە ئاین هەڵگەڕاونەتەوە، و ئەوانی تر دەڵێن: کوشتنەکەی حەدی تاوانەکەیەتی، و ئەبوحەنیفە لە نێو ئیمامەکاندا وادەبینێت ناکوژرێت، و دەڵێت بەند دەکرێت و لەبەرچاو ون دەکرێت و سزا دەدرێت هەتاکو نوێژ دەکات یان دەمرێت[١].

و عوبێد جابری لە (التقرير الأحمد)دا بۆچوونی ئەو زانایانە تەرجیح دەکات کە دەڵێن: کە نوێژنەکەر لەبەر تەمبەڵی و کەمتەرخەمی کافرە، و دەڵێت: بەڵگەی ڕیوایەتی دووەم لە ئەحمەدەوە کە نوێژنەکەر بە کافر دەزانێت و بۆچوونی هاوەڵە لێکۆڵەرەکانی و جگەلەوانیش بەهێزترە لە بەڵگەکانی جمهور[٢].

بەڵام لە تەرجیحی ئەم بۆچوونە پەشیمان بووەتەوە، و تەرجیحی بۆچوونی جمهوری زانایان کردووە کە نوێژنەکەر لەبەر تەمبەڵی و کەمتەرخەمی بە کافر نازانن، و دەڵێت: من لەم دوایەدا گەڕاومەتەوە

(١). بڕوانە: (شرح أصول السنة)(٧٨،٧٧).
(٢). بڕوانە: (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)(١١٣).

سەر بۆچوونی جمهور، هەرکەسێك جگە لەم بۆچوونەی لە منەوە بیستووە، ئەمە گەڕانەوەی منە، لەبەر کۆمەڵە بەڵگەیەك کە بۆم دەرکەوتووە[1].

(١). (تكحيل العينين بشرح عقيدة الرازيين)(٤٨).



## باشترینی هاوەڵان خەلیفە ڕاشدییەکانە

(وَخبر هَذِه الْأمة بعد نبيها أَبُو بكر الصّديق ثمَّ عمر بن الْخطاب ثمَّ عُثْمَان بن عفَّان، نقدم هَؤُلَاءِ الثَّلَاثَة كَمَا قدمهم أَصْحَاب رَسُول الله ﷺ لم يَخْتَلِفُوا فِي ذَلِك، ثمَّ بعد هَؤُلَاءِ الثَّلَاثَة أَصْحَاب الشورى الْخَمْسَة عَليّ بن أبي طَالب وَالزُّبَيْر وعبد الرحمن بن عَوْف وَسعد وَطَلْحَة كلهم يصلح للخلافة وَكلهمْ إِمَام، وَنَذْهَب فِي ذَلِك إِلَى حَدِيث ابْن عمر (كُنَّا نعد وَرَسُول الله ﷺ حَيّ وَأَصْحَابه متوافرون أَبُو بكر ثمَّ عمر ثمَّ عُثْمَان ثمَّ نسكت)، ثمَّ من بعد أَصْحَاب الشورى أهل بدر من الْمُهَاجِرين ثمَّ أهل بدر من الْأَنْصَار من أَصْحَاب رَسُول الله ﷺ على قدر الْهِجْرَة والسابقة أَولا فأولا.

ثمَّ أفضل النَّاس بعد هَؤُلَاءِ أَصْحَاب رَسُول الله ﷺ الْقرن الَّذِي بعث فيهم كل من صَحبه سنة أَو شهرا أَو يَوْمًا أَو سَاعَة وَرَآهُ فَهُوَ من أَصْحَابه لَهُ الصُّحْبَة على قدر مَا صَحبه وَكَانَت سابقته مَعَه وَسمع مِنْهُ وَنظر إِلَيْهِ نظر فأدناهم صُحْبَة أفضل من الْقرن الَّذِي لم يروه وَلَو لقوا الله بِجَمِيعِ



**الْأَعْمَال كَانَ هَؤُلَاءِ الَّذين صحبوا النَّبِي ﷺ ورأوه وسمعوا مِنْهُ أفضل لصحبتهم من التَّابِعين وَلَو عمِلُوا كل أَعمال الْخَيْر).**

**واته: باشترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەبوبەکری صدیقە، پاشان عومەری کوڕی خەتاب، پاشان عوسمانی کوڕی عەفان، ئەو سێ هاوەڵە پێش دەخەین وەك چۆن هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشیان خستن و ناکۆك نەبوون لەوبارەیەوە، دوای ئەو سێ هاوەڵە پێنج هاوەڵەکەی شورا عەلی کوڕی ئەبوتالب و زوبێر و عبدالرحمانی کوڕی عەوف و سەعد و تەلحە، هەموو شایان بوون بن بە خەلیفە و هەموویان ئیمامن، و باوەڕمان بەو فەرموودەیە هەیە کە ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: ئێمە پێغەمبەری خوا ﷺ زیندوو بوو و هاوەڵان بوونیان هەبوو ئەبوبەکر و عومر و عوسمانمان بە باشترین هاوەڵان دەزانی، پاشان بێدەنگ دەبووین، پاشان دوای ئەهلی شورا هاوەڵانی بەدر لە کۆچەرییەکان، پاشان هاوەڵانی بەدر لە پشتیوانان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوێرەی کۆچ و پێشەنگیان یەك لە دوای یەك.**

**پاشان باشترینی خەڵك دوای ئەوان ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەری خوان ﷺ لەو چەرخەدا کە پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا ڕەوانەکراوە، هەرکەسێك ساڵێك یان مانگێك یان ڕۆژێك یان ساتێك هاوەڵی کردبێت و بینی بێتی ئەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە گوێرەی هاوەڵییەتییەکەی و پێشەنگی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، و لێی بیستووە و تێی ڕوانیوە ئەو کەسەی کەمترین ماوە هاوەڵێتی کردبێت باشترە لەو چەرخەی کە نەیان بینیوە، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا هەموو کردەوەیەکی باشیان ئەنجامدابێت، ئەوانەی کە هاوەڵی پێغەمبەری خوایان ﷺ کردووە و بینیویانە و لێیان بیستووە ئەوان باشترینن لە تابعییەکان لەبەر هاوەڵێتییان، ئەگەر هەموو کردەوەیەکی چاکەش ئەنجام بدەن.**

ئەحمەد و ئەبوداود و ترمزی و ئیبن ماجە لە عربازی کوڕی سارییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((عليْكُم بسنَّتي وسنَّةِ الخلفاءِ الرّاشدين المَهديِّينَ مَن بعدي تمسَّكوا بِها وعضُّوا عليْها بالنَّواجذِ وإيّاكم ومحدثاتِ الأمورِ)).



واتە: دەست بگرن بە سوننەتی من و سوننەتی خەلیفە ڕاشدییە هیدایەتدراوەکانی دوای منەوە، توند دەستی پێوە بگرن و بە کاکیلەکانتان بیگەزن، و وریای داهێنراوەکانبن.

ئەلبانی دەڵێت: شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە لە (مجموع الفتاوى)(١٥٣/٣) دەڵێت: هەرکەسێك تانە بدات لە خیلافەتی ئەو پێشەوایانە لە گوێدرێژەکەی خۆیان گومڕاترە[1].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾(التَّوبَة).

واتە: پێشەنگەکان کە سەرەتا باوەڕیان هێنا لە کۆچەرییەکان و پشتیوانان و ئەوانەی بە باشی شوێنیان کەوتن، خوایان لێ ڕازی بوو، و ئەوانیش لە خوا ڕازین، و لە بەهەشتدا چەندان باخی بۆ

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص١٠٣).

ئامادەکردوون کە ڕووبار و جۆگەلەی ئاو بە ژێریاندا دەڕوات، بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئەوە بردنەوەی گەورە و مەزنە.

ڕاڤەکاران ناکۆکن لە لێکدانەوەی: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾، هەندێکیان دەڵێن: مەبەست لەو هاوەڵە بەڕێزانەیە کە نوێژیان بۆ هەردوو قیبلەکە کردووە، و هەندێکیان دەڵێن: ئەو هاوەڵانەیە کە لە پەیماننامەی ڕزواندا بەشدار بوون لە حودەیبیە، و هەندێکیان دەڵێن: مەبەست لەو هاوەڵانەیە کە بەشداری غەزای بەدریان کردووە، و هەندێکیان دەڵێن: مەبەست لە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، و هەندێکیان دەڵێن: هەموو ئەو هاوەڵانەیە کە پێش کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان بوون، قەنوجی دەڵێت: هیچ شتێك ڕێگر نییە ئەگەر بگوترێت ئایەتەکە هەموو هاوەڵانی مەبەستە، محمدی کوڕی کەعب دەڵێت: هەموو هاوەڵان دەگرێتەوە، چونکە ئەوان فەزڵی بینین و هاوەڵی پێغەمبەری خوایان ﷺ بە دەست هێناوە، ئەم ئایەتە بەڵگەی فەزڵی هاوەڵانی تێدایە زیاتر لەو موسڵمانانەی دوای ئەوان دێن، و ئەبومەنصوری بەغدادی دەڵێت: هاوەڵەکانمان کۆڕان کە باشترینی هاوەڵان چوار خەلیفە ڕاشدییەکانە پاشان ئەو شەشەی کە

مژدەی بەهەشتیان پێدراوە پاشان ئەو هاوەڵانەی لە غەزای بەدردا بەشدارییان کردووە، پاشان ئەوانەی لە غەزای ئوحوددا بەشدارییان کردووە پاشان ئەوانەی لە پەیماننامەی ڕزوان لە حودەیبیە بەشدارییان کردووە[(١)].

و ئیبن کەسیر دەڵێت: خوای گەورە هەواڵیداوە کە ڕازی بووە لە پێشەنگەکان کە سەرەتا باوەڕیان هێنا لە کۆچەرییەکان و پشتیوانان وئەوانەی بە باشی شوێنیان دەکەون، وەیل و تیاچوون بۆ ئەو کەسانەی کە ڕقی لێیانە، یان تانە و تەشەر و جنێو و قسەی نەشیاو بە هەموویان یان هەندێکیان دەڵێن، بە تایبەت سەروەری هاوەڵان و باشترینیان کە مەبەستم ئەبوبەکری ڕاستگۆی مەزنە رضي الله عنه، چونکە ئەو کۆمەڵە ڕافیزەی کە دژایەتی باشترینی هاوەڵان دەکەن و ڕقیان لێیانە و جنێو و قسەی نەشیاویان پێ دەڵێن پەنا بەخوا لەو کردەوە چەپەڵەیان، ئەوە بەڵگەیە کە ژیرییان لە دەستداوە و دڵیان هەڵگەڕاوەتەوە، ئەوانە ئایا باوەڕیان بە قورئان هەیە لە کاتێکدا جنێو

---

(١). (فتح البيان في مقاصد القرآن)(٣٨٢/٥).

بەو کەسانە دەدەن کە خوا لێیان ڕازی بووە؟ بەڵام ئەهلی سوننەت ڕازین لەوانەی خوا لێیان ڕازییە، و بە خراپ باسی ئەو کەسانە دەکەن کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە خراپ باسیان کردوون، و هەرکەسێکیان خۆش دەوێت کە خوا خۆشی بوێن، و دژایەتی هەرکەسێك دەکەن کە خوا دژایەتی بکات، ئەوان شوێنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەون و داهێنان ناکەن لە ئاییندا، و چاو لەو پێشینە چاکانە دەکەن و ئاینداری وەك ئەوان دەکەن، لەبەر ئەوەی حیزبی خوان کە سەرفراز وبەندەی باوەڕداری خوان[1].

و ئیبن تەیمییە دەڵێت: لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((خيرُ النّاسِ قَرْني ثمَّ الَّذينَ يلونَهم ثمَّ الَّذينَ يلونَهم ثمَّ الَّذينَ يلونَهم)). واتە: باشترین چەرخ ئەو چەرخەیە کە من تیایدا ڕەوانە کراوم، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان؛ خوا ﷻ لە پێشینەکان بە ڕەهایی ڕازی بووە، و لەوانەی شوێنیان کەوتوون ڕازی دەبێت بەو مەرجەی بە

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٢٠٣/٤).

جوانی شوێنی ئەوان بکەون، ئەمەش هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە شوێن پێشینە چاکەکان دەکەوێت هەتاکو ڕۆژی قیامەت[1].

و جمهوری زانایان دەڵێن: مەبەست لە پێشینەکان لەم ئایەتە ئەو کەسانەن پێش پەیماننامەی حودەیبیە بەخشیویانە و لە پێناوی ڕێگای خوا جەنگاون، و ئامادەبووانی بەیعەتی ڕزوان هەموویان دەگرێتەوە، کە لە هەزار وچوار سەد کەس زیاتر بوون[2].

ئەحمەد نەجمی دەڵێت: هاوەڵانی شورا ئەوەی کە باوە شەشن ئەو پێنجەی کە ئیمام ئەحمەد باسیکردوون لەگەڵ سەعیدی کوڕی زەید، پاشان دوای ئەوان هاوەڵانی عەقەبە، پاشان هاوەڵانی بەدر لە کۆچەرییەکان و پشتیوانان، پاشان هاوەڵانی بەیعەتی ڕزوان، پاشان ئەوانەی پێش فەتحی مەکە موسڵمان بوون و کۆچیان کرد و لە پێناوی خوا تێکۆشان، و ئەوانەی دوای فەتحی مەکە موسڵمان بوون و کۆچیان

(١). (النبوات)(٦٣٨/٢).
(٢). بڕوانە: (مجموع الفتاوى)(٦٠/٣٥).

کرد و لە پێناوی خوا تێکۆشان، پاشان هاوەڵە منداڵەکان، ڕیزبەندییان لە فەزڵ پلەوپایەیان بەم شێوەیەیە[١].

خودا دەفەرموێت: ﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ١٨﴾(الفَتْح).

واتە: خوا ڕازی بوو لەو باوەڕدارانەی لە ژێردارەکە لە حودەیبییە بەیعەتیان پێدایت خوا دەیزانی چی لە ناخیاندایە، خوا ئارامی و هێوری بەسەردا دابەزاندن.

و دەفەرموێت: ﴿لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ ١٠﴾(الحَدِيد).

(١). (شرح أصول السنة)(١٠٥ـ١٠٦).

واتە: وەك یەك نین ئەوانەی پێش فەتحی مەككەماڵیان بەخشیوە و جەنگاون، ئەوانە پلەیان لەو كەسانە بەرز و بڵندترە كە دوای فەتحی مەككە ماڵیان بەخشیوە و جەنگاون، و خوا بەڵێنی بەهەشتی بە هەمووانداوە.

و دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩﴾(الفَتْح).

واتە: محمد پێغەمبەری خوایە و ئەوانەی كە لەگەڵیدان توندن لە دژی بێبڕواكان، و بەسۆز و بەزەیین لە نێوان یەكتردا، دەیانبینیت كڕنوش و سوژدەیان بردووە بەو كارەیان ڕەزامەندی پەروەردگاریان دەوێت لە دوارۆژدا، لە نێوچاوانیاندا ئاسەوار و نوری سوژدە و پەرستشی زۆریان دیارە، ئەوە نموونەیان بوو لە تەورات، و نموونەیان

له ئینجیل وەك درەختێكه چرۆی دەرهێناوه و قەدەكەی بەهێز دەكەن و لەسەر ڕەگەكانی خۆیان ڕادەگرن و جوتیارەكانی سەرسام دەكات به جوانی و باشی گوڵ و بەرهەمەكەی، شێوەی هاوەڵان ئاوهایه بۆ ئەوەی بێبڕواكان توڕە و غەمبار بكات، خوا بەڵێنی بەوانەیان داوه كه باوەڕیان هێناوه و كردەوەی باش دەكەن به لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە.

و ئیبن حبان له عبدالرحمانی كوڕی عەوفەوه ﷺ ڕیوایەتی كردووه و ئەلبانی به صەحیحی داناوه، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَبُو بَكْرٍ فِي الجَنَّةِ وعُمَرُ فِي الجَنَّةِ وعُثْمانُ فِي الجَنَّةِ وعَلِيٌّ فِي الجَنَّةِ وطَلْحَةُ فِي الجَنَّةِ والزُّبَيْرُ فِي الجَنَّةِ وعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الجَنَّةِ وسَعْدُ بْنُ أَبِي وقّاصٍ فِي الجَنَّةِ وسَعِيدُ بْنُ زَيْدٍ فِي الجَنَّةِ وأبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرّاحِ فِي الجَنَّةِ)).

واته: ئەبوبەكر، عومەر، عوسمان، عەلی، تەلحە، زوبێر، عبدالرحمانی كوڕی عەوف، سەعدی كوڕی ئەبووەقاص، سەعیدی كوڕی زەید، و ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاح له بەهەشتدان.

صالح ئال الشيخ دەڵێت: ئەو دە کەسە گوتراوە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، لەبەر ئەوەی ئەو مژدەیە تایبەتە بەوانەوە لەو فەرموودەیەوە، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی بەهەشتی بە ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵانداوە، مژدەی بە بیلال و خەدیجە و عائشە و عوکاشەی کوڕی محصن و کەسانی تریش داوە، ئەو دە کەسە تایبەتکراون لەبەر ئەوەی باشترینی ئەم ئوممەتەن، و لەبەر ئەوە لە یەك فەرموودە و شوێندا مژدەی بەهەشتیان پێدراوە[(١)].

و بوخاری و مسلم لە عەلی کوڕی ئەبوتالبەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەربارەی حاتبی کوڕی ئەبوبەلتیعە رضي الله عنه دەفەرموێت: ((إِنَّه قدْ شَهِدَ بَدْرًا، وما يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ علَى مَن شَهِدَ بَدْرًا، فَقالَ: اعْمَلُوا ما شِئْتُمْ؛ فقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ)).

واتە: ئەو بەشداری بەدری کردووە، چۆن دەزانیت شایانی کوشتنە، خوا سەیری ئەهلی بەدری کرد و پێی فەرموون: هەرچی کردارێك ئەنجام دەدەن، ئەنجامی بدەن، من لێتان خۆش بووم و تاوانەکانتان دەپۆشم.

(١). (شرح العقيدة الطحاوية)(٦٤٨).



و مسلم لە ئوم موبەشیرەوە ﵂ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ لای حەفصە ﵂ فەرمووی: ((لا يَدْخُلُ النّارَ، إنْ شاءَ اللهُ، مِن أصْحابِ الشَّجَرَةِ أحَدٌ، الَّذِينَ بايَعُوا تَحْتَها)).

واتە: إن شاء الله کەس لەو هاوەڵانەی کە لە ژێر دارەکەی حودەیبییە بەیعەتیاندا ناچنە ئاگرەوە.

و بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا تَسُبُّوا أصحابِي، فإنَّ أحَدَكم لو أَنفَق مِثلَ أُحُدٍ ذهَبًا ما بلَغ مُدَّ أَحَدِهم ولا نَصيفَه)).

واتە: جنێو و قسەی نەشیاو بە هاوەڵانم مەڵێن، بێگومان ئەگەر کەسێکتان بە هاوشێوەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت، ناگاتە ئەوەی کەسێك لە هاوەڵان مشتێك یان نیو مشتی بەخشی بێت.

تەبەرانی و ئەبونەعیم و خەتیب لە ئیبن مەسعودەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إذا ذُكِرَ أصحابِي فأمسِكُوا)).



واتە: ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا زمانتان بپارێزن.

بەڵکو ترمزی لە جابری کوڕی عبداللهوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی لە (مشکاة المصابیح)دا بە حەسەنی داناوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا تَمَسُّ النّارُ مُسْلِمًا رَآنِي أو رأى من رَآنِي)).

واتە: هەر موسڵمانێك منی بینی بێت، یان هاوەڵێكی منی بینی بێت، ئاگری دۆزەخ ناچێژێت.

زۆر ئایەت و فەرموودەی تر دەربارەی فەزڵی هاوەڵان بە گشتی و بە تایبەت هاتووە، هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی باشترین ئوممەتی ئیسلامن دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەرچی پلەوپایەی هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەرز و باڵاترە، و خۆشویستنیان بە تایبەتی پشتیوانان نیشانەی باوەڕە و ڕق لێ بوونیان نیشانەی دووڕووییە، مسلم لە ئەنەسەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((آيَةُ الإيمانِ حُبُّ الأنْصارِ، وآيَةُ النِّفاقِ بُغْضُ الأنْصارِ)).

واتە: نیشانەی باوەڕ خۆشویستنی پشتیوانانە، و نیشانەی دووڕوویی ڕق لێبوونی پشتیوانانە.

و مسلم لە ئەبوسەعید و ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا يُبْغِضُ الأنْصارَ رَجُلٌ يُؤْمِنُ بِاللهِ واليَوْمِ الآخِرِ)).

واتە: کەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوای هەبێت ڕقی لە پشتیوانان نابێت.

و بوخاری و مسلم لە بەرائی کوڕی عازبە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ((الأنْصارُ لاَ يُحِبُّهُمْ إلّا مُؤْمِنٌ، ولاَ يُبْغِضُهُمْ إلّا مُنافِقٌ، فَمَن أحَبَّهُمْ أحَبَّهُ اللَّهُ، ومَن أبْغَضَهُمْ أبْغَضَهُ اللَّهُ)).

واتە: پشتیوانان کەسی باوەڕدار نەبێت خوشی ناوێن، و کەس ڕقی لێیان نابێت جگە لە کەسی دووڕوو، هەرکەسێك خۆشی بوێن خوا خۆشی دەوێت، و هەرکەسێك ڕقی لێیان بێت خوا ڕقی لێی دەبێت.



و مسلم لە عەلی کوڕی ئەبوتالبەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((والَّذِي فَلَقَ الحَبَّةَ، وبَرَأَ النَّسَمَةَ، إنَّهُ لَعَهْدُ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ ﷺ إلَيَّ: أنْ لا يُحِبَّنِي إلّا مُؤْمِنٌ، ولا يُبْغِضَنِي إلّا مُنافِقٌ)).

واتە: سوێند بەو کەسەی تۆو دەقڵیشێنێ و شەقی دەکات، و مرۆڤەکانی دروست کردووە، بەڵێن و پەیمانی پێغەمبەری نەخوێندەوارە ﷺ بۆ من: کەس خۆشی ناوێم باوەڕدار نەبێت، و کەس ڕقی لێم نابێت دووڕوو نەبێت.

و عوسمان ﵁ ئەو کەسەیە کە زاوای پێغەمبەری خوایە ﷺ، و مێردی هەردوو کچەکەیەتی (ڕوقیە و ئوم کەلسوم)، و نەزانراوە کەسێکی تر هەبێت ئەو ڕێز و فەزڵەی دەستکەوتبێت بە درێژایی مێژوو، یەکێکە لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتی پێدراوە، یەکێك بووە لەو کەسانەی قورئانی زۆر بە باشی لەبەر بوو و فەرموودەیەکی زۆری زانیوە، و زۆر ڕەوشت بەرز بووە و کردەوەی زۆری کردووە، ئەو کەسەیە کە پارە و سامانی زۆری بەخشیوە لە ڕێگەی خوا، و هیچ کەس لە سەردەمی هاوەڵاندا هێندەی ئەو پارە و سامانی لە ڕێگەی خوا

نەبەخشیوە، وئەو کەسەیە کە دوو جار کۆچی کردووە، کۆچێك بۆ حەبەشە و کۆچێك بۆ مەدینە.

بوخاری و مسلم لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَدِيقَةِ بَنِي فُلانٍ، وَالْبَابُ عَلَيْنَا مُغْلَقٌ وَمَعَ النَّبِيِّ ﷺ عُودٌ يَنْكُتُ وَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَنْكُتُ بِذَلِكَ الْعُودِ فِي الأَرْضِ إِذِ اسْتُفْتِحَ الْبَابُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: يَا عَبْدَ اللَّهِ ابن قَيْسُ، قُمْ فَافْتَحْ لَهُ الْبَابَ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تَكُونُ، فَقُمْتُ فَفَتَحْتُ لَهُ الْبَابَ، وَإِذَا بِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: الْمُسْتَعَانُ اللَّهُ، أَوْ عَلَى اللَّهِ التُّكْلانُ، ثُمَّ دَخَلَ فَسَلَّمَ وَقَعَدَ)).

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم لە باخچەی کوڕەکانی فلان، و دەرگاکەمان لەسەر داخرا بوو، و پێغەمبەری خوا ﷺ دارێك بە دەستییەوە بوو لە زەوی دەدا لەو کاتەدا یەکێك لە دەرگاکەی دا، فەرمووی: ئەی عبداللەی کوڕی قەیس هەستە دەرگاکەی بۆ بکەرەوە و مژدەی بەهەشتی بدەرێ لەسەر کێشە و ئاشوبێك کە تووشی دەبێت، هەستام دەرگاکەم بۆ کردەوە بینیم عوسمانی کوڕی عەفانە ﵁،

ئەوەم پێ ڕاگەیاند کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی، گوتی: پشت پێبەستراو تەنها خوایە، یان پشت بە خوا دەبەسترێت، ئیدی هاتە ژوورەوە و سەلامی کرد و دانیشت.

و بوخاری لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كُنَّا نَعُدُّ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَيٌّ وَأَصْحَابُهُ مُتَوَافِرُونَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ ثُمَّ نَسْكُتُ)).

واتە: ئێمە دەمان ژمارد لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ زیندوو بوو و هاوەڵانیش بوونیان هەبوو لە پێشەنگی و فەزڵ و پلەوپایەدا: ئەبوبکر وعمر و عوسمان، پاشان بێدەنگ دەبووین.

و دیسان لێیەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كُنَّا فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ لاَ نَعْدِلُ بِأَبِي بَكْرٍ أَحَداً ثُمَّ عُمَرَ ثُمَّ عُثْمَانَ ثُمَّ نَتْرُكُ أَصْحَابَ النَّبِيِّ لاَ نُفَاضِلُ بَيْنَهُمْ)).

واتە: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هیچ کەسمان بە ئەبوبکر یەکسان نەدەکرد و لە ئاستی ئەومان نەدەزانی، دواى ئەو عمر، دواى

ئەو عوسمان دوای ئەوان لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا ﷺ کەسمان بەسەر کەسدا نەدەدا.

و لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ صَعَدُوا أُحُدًا، فَرَجَفَ بِهِمْ، فَضَرَبَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرِجْلِهِ، وَقَالَ: اثْبُتْ أُحُدُ فإنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدّيقٌ وَشَهِيدَانِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبکر و عمر و عوسمان چوونە سەر کێوی ئوحود، لەرزاندیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێی لێیدا و فەرمووی: ئوحد خۆڕاگرە و جێگیربە چونکە پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهیدت لەسەرە.

و مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُضْطَجِعًا فِي بَيْتِهِ كَاشِفًا عَنْ فَخِذَيْهِ أَوْ سَاقَيْهِ، فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ فَأَذِنَ لَهُ، فَدَخَلَ وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرَ، فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانَ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ق وَسَوَّى ثِيَابَهُ، فَدَخَلَ فَتَحَدَّثَ، فَلَمَّا خَرَجَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ،

دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ، فَلَمْ تَهْتَشَّ لَهُ وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ، فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ؟ فَقَالَ: أَلا أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلائِكَةُ)).

واتە: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەیدا ڕاکشابوو ڕانەکانی یان لاقەکانی بە دەرەوە بوون، ئەبوبکر ڕوخسەتی خواست، ڕوخسەتی پێدرا لەسەر ئەو حاڵەتە بوو قسەی دەکرد، دواتر عمر ڕوخسەتی خواست ڕوخسەتی پێدرا هەر لەسەر ئەو حاڵەتە بوو قسەی دەکرد، دواتر عوسمان ڕوخسەتی خواست پێغەمبەری خوا ﷺ جلوبەرگەکەی ڕێکخست و دانیشت، هاتە ژوورەوە و قسەی دەکرد، کاتێك دەرچوو عائشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبکر هاتە ژوورەوە و نەجوڵایت و گرنگ نەبوو بەلاتەوە، دواتر عمر هاتە ژوورەوە و نەجوڵایت وگرنگ نەبوو بەلاتەوە، دواتر کە عوسمان هاتە ژوورەوە دانیشتیت و جلوبەرگەکەت ڕێکخست؟ فەرمووی: ئایا شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتە شەرمی لێ دەکات.

و ئەحمەد و ترمزی لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە و ترمزی و ئیبن کەسیر و ئەلبانی بە حەسەنیان داناوە، دەڵێت: ((ذَكَرَ



رسولُ اللهِ ﷺ فِتنَةً، فمَرَّ رَجُلٌ فقال: يُقتَلُ فيها هذا المُقنَّعُ يَومَئذٍ مَظْلومًا، قال: فنَظَرتُ، فإذا هو عُثمانُ بنُ عَفّانَ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی فیتنە و ئاشوبی کرد، پیاوێك تێپەڕی فەرمووی: ئەم دەمامەکدارە لەو ڕۆژەدا بە ستەم لێکراوی دەکوژرێت، دەڵێت: دیقەتم دا بینیم عوسمانی کوڕی عەفانە رضي الله عنه .

و ئەحمەد و نەسائی لە السنن الكبرى و حاکم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ابْنا العاصِ مُؤْمِنانِ هِشامٌ وعَمْرٌو)).

واتە: دوو کوڕەکەی عاص، هیشام و عەمر رضي الله عنهما باوەڕدارن.

و ئەحمەد و ترمزی لە عوقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((أسْلَمَ الناسُ، وآمَنَ عمرُو بنُ العاصِ)).

واتە: خەڵك موسڵمان بوون و عەمری کوڕی عاص رضي الله عنه باوەڕی هێنا.

دیسان لە تەلحەی کوڕی عوبەیداللەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ((عَمْرُو بنُ العاصِ مِن صالِحي قُرَيشٍ)).

واتە: عەمری کوڕی عاص ﷺ لە پیاو چاکانی قورەیشە.

و ئەحمەد و حاکم و ئەبویەعلا و بەغەوی لە عەمری کوڕی عاصەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: ((أرسلَ إليَّ رسولُ اللّهِ ﷺ أنِ اجمع عليكَ سلاحكَ وثيابكَ ثُمَّ ائتِني قالَ: فأتيتُهُ وهوَ يتوضَّأُ فقالَ يا عمْرو إنِّي أرسلتُ إليكَ لأبعثَك في وجهٍ يسلِّمُك اللّهُ ويغنِّمُك وأزعبَ لَك زعبةً منَ المالِ فقلتُ يا رسولَ اللّهِ ما كانت هجرتي للمالِ ما كانت إلّا للّهِ ولرسولِه فقالَ نعمّا بالمالِ الصّالحِ للرَّجلِ الصّالحِ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێنم دا، کە جلوبەرگ و چەك و تفاقت کۆ بکەرەوە و وەرە بۆلام، دەڵێت: هاتم بۆلای دەست نوێژی دەگرت، فەرمووی: ئەی عەمر ناردم بە شوێنتدا بۆ ئەوەی بتنێرم بۆ شوێنێك خوا بتپارێزێت و ماڵ و پارەت دەست بخات و بڕێك پارەت بدەمێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من کۆچم نەکردووە لەبەر پارە



و ماڵ، بەڵكو تەنها لەبەر خوا و پێغەمبەرەكەی كۆچم كردووە، فەرمووی: چەند باشە كە پارە و ماڵی باش بۆ كەسی باش بێت.

و مسلم لە جابرەوە ﵁ ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ((أَنَّ عَبْدًا لِحاطِبٍ جاءَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَشْكُو حاطِبًا فَقالَ: يا رَسُولَ اللهِ لَيَدْخُلَنَّ حاطِبٌ النّارَ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَذَبْتَ لا يَدْخُلُها، فَإِنَّهُ شَهِدَ بَدْرًا والحُدَيْبِيَةَ)).

واتە: بەندەیەكی حاتب ﵁ هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حاتب دەچێتە ئاگرەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: درۆتكرد ناچێتە ئاگرەوە لەبەر ئەوەی بەشداری بەدر و حودەیبییەی كردووە.

و بوخاری و مسلم لە جابرەوە ﵁ ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: ((كُنَّا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ أَلْفًا وَأَرْبَعَ مِائَةٍ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﵁: أَنْتُمْ الْيَوْمَ خَيْرُ أَهْلِ الْأَرْضِ)).

واتە: ئێمە ڕۆژی حودەیبییە هەزار و چوار سەد كەس بووین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە ئەمڕۆ باشترین خەڵكی سەر زەوین.



و ئیبن ئەبو شەیبە و تەبەرانی لە واسلەی کوڕی ئەسقەعەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لا تَزالونَ بِخَيْرٍ ما دامَ فيكُمْ مَن رَآنِي وصاحَبَنِي، وللهِ لا تَزالونَ بِخَيْرٍ ما دامَ فيكُمْ مَن رأى مَن رَآنِي وصاحَبَ مَن صاحَبَنِي، واللهِ لا تَزالونَ بِخَيْرٍ ما دامَ فيكُمْ مَن رأى مَن رأى مَن رَآنِي، وصاحَبَ مَن صاحَبَ مَن صاحَبَنِي)).

واتە: بەردەوام لە خێردان هەتا ئەوکاتەی ئەو کەسانەتان لە نێودایە کە منی بینیووە و هاوەڵی کردووم، و سوێند بە خوا بەردەوام لە خێردان هەتا ئەوکاتەی ئەو کەسانەتان لە نێودایە کە ئەوانەیان بینیوە کە منی بینیوە و هاوەڵی کردووم، و سوێند بە خوا بەردەوام لە خێردان تا ئەوکاتەی ئەو کەسانەتان لە نێودایە کە تابعیەکانی بینیوە.

بەڵگە زۆرە لە قورئان و سوننەتدا لەسەر فەزڵ و پلەوپایەی هاوەڵان، و ئەمانە هەندێك لە ڕێز وپلە وپایەی هاوەڵانە:

١ . پێشەنگی و پێشەوایەتیان لە ئیسلامەتی.

٢ . ئارامگرتنیان لە كاتی ناڕەحەتی و ئاستەنگ و هەوراز و نشێوەكان.

٣ . هاوەڵێتی پێغەمبەری خوا ﷺ، و سەرخستن و فیداكاری لە پێناویدا.

٤ . كۆچكردن و پەنادانان.

٥ . سەرخستنی ئیسلام وجیهاد و تێكۆشان، و قوربانیدان بە ماڵ و سامان و نەفسیان.

٦ . پێشەواییان لە زانست و كردەوە، و خوڕەوشتیان.

٧ . گەیاندنی ئاین، و ڕوونكردنەوەی.

٨ . نەسرەوتن هەتاكو ئیسلامیان سەرخست و بە جیهانیان گەیاند.

و ئیبن تیمیە دەڵێت: لە بنچینەكانی ئەهلی سوننەت وجەماعەتە پاراستنی دڵ وزمانیان لە ئاست هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ، وەك چۆن خوا وەسفی كردوون: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾(الحَشْر).

واتە: ئەوانەی دوای هاوەڵان هاتوون دەڵێن: پەروەردگارمان لە ئێمە خۆشبە و لەو برایانەمان کە لە پێش ئێمە باوەڕدار بوون، و لە دڵماندا هیچ ڕق و کینەیەك بەرامبەر باوەڕداران دروست مەکە، پەروەردگارمان تۆ بە سۆز وبەزەییت.

و پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لا تَسُبُّوا أصحابي، فإنَّ أحَدَكم لو أَنفَق مِثلَ أُحُدٍ ذهَبًا ما بلَغ مُدَّ أَحَدِهم ولا نَصيفَه)).

واتە: جنێو و قسەی نەشیاو بە هاوەڵانم مەڵێن، بێگومان ئەگەر کەسێکتان بە هاوشێوەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت، ناگاتە ئەوەی کەسێك لە هاوەڵان مشتێك یان نیو مشتی بەخشی بێت.

و ئەوەی کە قورئان و سوننەت و کۆدەنگی زانایان لە فەزڵ و پلە و پایەیان هاتبێت بۆیان دەسەلمێنین و پەسەندی دەکەن، و فەزڵی ئەوانەی پێش ڕزگارکردنی مەکەماڵیان بەخشیوە و تێکۆشاون، کە پەیماننامەی حودەیبیەیە، دەدەن بەسەر ئەوانەی دوای ئەوە ماڵیان بەخشیوە و تێکۆشاون، و کۆچەرییەکان دەدەن بەسەر پشتیوانەکاندا، و باوەڕیان وایە کە خوا بە بەدرییەکانی فەرمووە: ((اعْمَلُوا مَا شِئْتُم

فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ))، كە ژمارەیان سێ سەد و یازدە تا نۆزدەكەس بوون، هەروەها هەركەسێك لە ژێردارەكە لە حودەیبیە بەیعەتی دابێت ناچێتە ئاگرەوە وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی لەو بارەوە داوە، بەڵكو خوایان لێ ڕازی بوو و ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون، كە لە هەزار وچوار سەد كەس زیاتر بوون، و دان بە بەهەشتدا دەنێن بۆ هەركەسێك كە پێغەمبەر ﷺ گەواهی بەهەشتی بۆ دابێت، وەك دە كەسە مژدە پێدراوەكە و سابتی كوڕی قەیسی كوڕی شەماس، و هاوەڵانی تر.

و دان بەوەدا دەنێن كە بەموتەواتری لە علی كوڕی ئەبوتالب و هاوەڵی ترەوە هاتووە كە دەڵێن: باشترین كەسی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەكەی ﷺ: ئەبوبكرە، ئینجا عمرە، و سێیەم عوسمانە،چوارەم علی یە، كە بەڵگە لەسەر ئەوە هاتووە، هەروەها هاوەڵان كۆڕابوون لە پێش خستنی عوسمان لە بەیعەتدا، ئەگەرچی هەندێك لە ئەهلی سوننەت ناكۆك بوون لە عوسمان و علی دا كە كامیان باشترە، دوای ئەوەی ڕێككەوتن لەسەر ئەبوبكر و عمر، كەسانێك عوسمانیان پێش خست، و بێدەنگ بوون، یان عەلییان بە چوارەمدا، و

هەندێك عەلییان پێش خست، و هەندێك وەستان، بەڵام ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوە ڕاوەستان کە عوسمان پێش علی یە، ئەگەرچی ئەم پرسە، پرسی علی و عوسمان، لە بنچینەکان نییە کە پێچەوانەکانی پیٚ گومڕا بکرێت لای زۆربەی ئەهلی سوننەت، بەڵام ئەوەی دەبێتە مایەی گومڕابوون، پرسی خەلافەتە، بەوەی کە باوەڕیان وایە کە خەلیفە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبکر، عمر، عوسمان، و علی یە، ئەگەر کەسێك تانە لە خەلافەتی یەکێك لەوان بدات، ئەوە لە گوێدرێژەکەی نەفامترە.

دواتر دەڵێت: خۆ بەدوور دەگرین لە ڕێگەی ڕەوافزەکان کە ڕقیان لە هاوەڵانە و جنێویان پێدەدەن و ناماقوڵییان بەرامبەر دەکەن، و ڕێگەی نەواصبەکان کە ئازاری ئەهلی البیت دەدەن بە گوتە و بەکردار، و زمانیان دەپارێزن لەوەی کە لەنێوان هاوەڵان ڕوویداوە، و دەڵێن: ئەو ڕیوایەتانەی لە بارەی خراپەیان گێڕڕاوەتەوە هەیانە هەڵبەستراو و درۆیە، و هەیانە کەم وزیادکراوە و لە مەبەستەکەی هەڵەکراوە، ئەوەی ڕاستە ئەوان تیایدا عوزریان هەیە بەوەی کە ئیجتیهادیان کردووە و پێکاویانە، یان ئیجتیهادیان کردووە و نەیانپێکاوە، ئەوە لە کاتێکدا باوەڕیان وایە کە هاوەڵان پارێزراو نین لە هەڵە و تاوانە گەورەکان و



بچوکەکان، بەڵکو بەگشتی دەشێت هەڵە یان تاوان بکەن، بەڵام هێندە پێشینەی باشیان هەیە پاساوی ئەوەیان بۆ دەکات کە خوا لێیان خۆشبێت، هەتا بە شێوەیەك لە تاوانەکانیان دەبووریێت، کە بەو شێوەیە لە تاوانی ئەوانەی دوای ئەوان نابوریێت، چونکە هێندە چاکەیان هەیە کە هەڵە و تاوانەکانیان بسڕێتەوە، دوای ئەوان ئەو چاکانەیان نییە، و بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە سەلماوە کە ئەوان باشترین چەرخن، و مشتێك کە یەکێك لە هاوەڵان بیبەخشێت باشترە لە هێندەی کێوی ئوحود زێڕی ئەوانەی دوای ئەوان بیبەخشن، دواتر ئەگەر کەسێکیان گوناهێکی کردبێت لەوانەیە تەوبەی لێکردبێت، یان چاکەیەکی کردبێت سڕیبێتییەوە، بە هۆی پێشەنگی لە ئیسلام، یان بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ کە ئەوان شایانترین کەسن بە شەفاعەتی، یان لە دونیا تووشی ناڕەحەتییەك بووە بە هۆیەوە خوا ﷻ لە تاوانەکانیان خۆشبووە، ئەمە ئەگەر لە تاوانە ڕاستەقینە ئەنجامدراوەکاندا وابێت، چۆن دەبێت وانەبێت لەو کار و کردەوانەی کە



ئیجتهادیان تێدا کردووە، کە ئەگەر پێکابێتیان دوو پاداشت و نەیان پێکابێت یەك پاداشتیان بۆ هەیە[١].

هەندێك درێژەم بە باس و پلەوپایە و فەزڵی هاوەڵاندا چونکە لەم سەردەمانەی دوایدا کەسانێکی موفەکر و بانگخواز پەیدابوون سوننەتی ڕەوافز و نەواصب و خەوارجەکانی کۆنیان زیندوو کردووەتەوە، تانە و تەشەر و قسەی نەشیاو بە هەندێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان دەڵێن، یەکێك لەو کەسانە سەید قوتب کە لە نوسینێکیدا دەربارەی هاوەڵی بەڕێز عەمری کوڕی عاص ﵁ دەڵێت: موعاویە و عەمری هاوڕێی سەرنەکەوتن بەسەر عەلی دا لەبەر ئەوە نەبوو کە شارەزاترین بە دەروونی خەڵك، و لێزانترین بە هەڵسوکەوتی شیاو لە کات و شوێنی پێویستدا، بەڵکو ئەوان ئازاد بوون لە بەکارهێنانی هەموو چەك و ئامرازێك، و ئەویش وابەستەی ڕەوشت و ئاکاری بوو لە هەڵبژاردنی ئامرازەکانی کێشەی نێوانیان، کاتێك موعاویە و هاوڕێکەی مەیلیان دایە درۆ و گزی و فێڵ و دووڕووی و بەرتیلدان و کەسایەتی کڕین، عەلی

---

(١). بڕوانە: (شرح العقيدة الواسطية لابن عثيمين)(٢/٢٧٢).



نەیتوانی دابەزێتە ئەو ئاستە ڕیسواییە، ئیدی سەرسوڕهێنەر نییە کە ئەوان سەرکەون و ئەمیش نوشوست بهێنێت، نوشوستێك کە باشترە لە هەموو سەرکەوتنێك.

سەرکەوتنی موعاویە بەسەر عەلی دا، لەبەر چەند هۆکارێك بوو کە لە هەردووکیان گەورەتر بوو: سەرکەوتنی نەوەیەك بوو بەسەر نەوەیەکدا، و سەردەمێك بەسەر سەردەمێکدا، و بۆچوونێك بەسەر بۆچوونێکدا، ئەو کات هەڵکشانی ڕۆحی بەرز و بڵندی ئیسلامی لە داکشاندا بوو، زۆرێك لە عەرەب هەڵگەڕابوونەوە بەرەو ئەو هەڵدێرەی کە ئیسلام دەریهێنابوون لێی، لە کاتێکدا عەلی لە لوتکەدا مایەوە و شوێنی ئەم داکشانە نەکەوت، سەرنەکەوتن و نوشوستی لەوەوە سەرچاوەی گرت، ئەوە سەرنەکەوتنێکە کە لە هەموو سەرکەوتنێك باش و ویستراوترە.(کتب وشخصیات)(٢٤٢ــ٢٤٣).

## گوێڕایەڵی دەسەڵاتداران لە چاکەدا

**(والسمع وَالطَّاعَة للأئمة وأمير الْمُؤمنِينَ الْبر والفاجر وَمن ولي الْخلَافَة وَاجْتمعَ النَّاس عَلَيْهِ وَرَضوا بِهِ، وَمن غلبهم بِالسَّيْفِ حَتَّى صَار خَليفَة وَسمي أَمِير الْمُؤمنِينَ).**

واتە: بیستن و گوێڕایەڵی بۆ کاربەدەستان و فەرمانڕەوەکانی باوەڕداران، چاکەکار و خراپەکاریان، و هەرکەسێك خەلافەت بگرێتە دەست، و خەڵك کۆببنەوە لە دەوری و پێی ڕازیبن، و هەرکەسێکیش بە شمشێر زاڵ بێت بەسەریاندا هەتاکو دەبێتە خەلیفە و پێی دەگوترێت: فەرمانڕەوای باوەڕداران، گوێڕایەڵی دەکرێن.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾(النِّسَاء).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا و کاربەدەستەکانتان بکەن، ئەگەر لە شتێك ناکۆك بوون بیگەڕێننەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە چاکترین کردارە، ئەو گەڕانەوەیە بۆ لای قورئان و سوننەت گەڕانەوەیە بۆ لای باشترین سەرچاوە بۆ چارەسەری ناکۆکییەکان.

مسلم لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((تَسْمَعُ وتُطِيعُ لِلْأمِيرِ، وإنْ ضُرِبَ ظَهْرُكَ، وأُخِذَ مالُكَ، فاسْمَعْ وأطِعْ)).

واتە: گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریی ئەمیر دەکەیت، ئەگەر لە پشتی دایت و سامانیشی بردیت، گوێڕایەڵ بە.

ئایینی ئیسلام ئایینێکی واقعییە هاتووە بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژین و ئایینی خەڵك، لەو سۆنگەیەوە فەرمان بە موسڵمانان دەکات کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوابن هەروەها گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەرەکەیبن ﷺ، گوێڕایەڵی کاربەدەستان بکەن کە بریتین لە:

فەرمانڕەوای موسڵمانان و زاناکانی ئایین، کاتێك فەرمان بە خەڵك دەکەن بە کاروکردەوەیەك کە پێچەوانەی فەرمانی خوا وپێغەمبەرەکەی ﷺ نەبێت، جێی داخە کە لەم سەردەمەدا زۆرترین چەواشەکاری بەرانبەر گوێڕایەڵی دەسەڵاتداران کراوە لە لایەن لاڕێکانەوە، ئەوە لە کاتێکدا خۆیان شەیدای کورسی و دەسەڵاتن، چۆن بۆیان بلوێت بە پێی بەرژەوەندی تەسکی تاکە کەسی و حیزبی بڕیارەکانیان دەگۆڕن، ئەو هەڵوێستە لە دەسەڵات و دەسەڵاتدارانی موسڵمانان بەرمەبنای حەز و ئارەزوو نییە، بەڵکو ئەوە بنەمایەکە لە بنەماکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و زانایان لە دووتوێی نووسراوەکانیان بە درێژی باسیان کردووە و لەبەر نەڕشتنی خوێنی موسڵمانان بە ناڕەواو و کاولنەکردنی وڵات و نیشتمانە، بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((عَلى المَرْءِ المُسْلِمِ السَّمْعُ والطّاعَةُ فِيما أحَبَّ وكَرِهَ، إلّا أنْ يُؤْمَرَ بمَعْصِيَةٍ، فإنْ أُمِرَ بمَعْصِيَةٍ، فلا سَمْعَ ولا طاعَةَ)).



واتە: گوێ بۆ گرتن و گوێڕایەڵی پێویستە لەسەر موسڵمان لە هەر شتێكدا كە پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە، ئەگەر فەرمانی پێ نەكرا بە سەرپێچی خوا، ئەگەر فەرمانی پێ كرا بە سەرپێچی خوا گوێڕایەڵی ناكرێت.

و بوخاری لە ئەنەسەوە ﵁ ڕیوایەتی كردووە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((اسْمَعُوا وأطِيعُوا وإنِ اسْتُعْمِلَ حَبَشِيٌّ كَأنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ)).

واتە: گوێ بگرن و گوێڕایەڵبن ئەگەر ئەو كەسەی كرا بە فەرمانڕەواتان بەندەیەكی حەبەشی بوو قژی سەری وەك مێوژ وابوو.

و مسلم لە ئەبوزەرەوە ﵁ ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ((إنَّ خَلِيلِي أوْصانِي أنْ أسْمع وأُطِيعَ، وإنْ كانَ عَبْدًا مُجَدَّعَ الأطْرافِ)).

واتە: خۆشەویستم محمد ﷺ وەسییەتی بۆ كردووم كە ببیستم و گوێڕایەڵبم، ئەگەر فەرمانڕاوەكە بەندەیەكیش بێت و دەست و پێشی بڕا بێت.

ئەو کاربەدەستانەی کە لەو فەرموودانە باس کراون دەبێت موسڵمان بن، ئەوانە و چەندان فەرموودەی تری هاوشێوەیان لەسەر ئەو باسە هاتووە زۆر ڕاشکاوانە باسی گوێڕایەڵی کاربەدەستانی موسڵمانان دەکات.

ئەلبانی دەڵێت: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾ ئاشکرایە ئەوە تایبەتە بە موسڵمانان، بەڵام بێباوەڕە داگیرکارەکان گوێڕایەڵی ناکرێن، بەڵکو پێویستە موسڵمانان خۆیان ئامادە بکەن بۆ دەرکردنیان و پاککردنەوەی وڵات لە پیسییان، و لێکدانەوەی ﴿مِنكُمۡ﴾ بەوەی هەرکەسێك بووە کاربەدەستتان بیدعەیەکی قادیانییەکانە بەفیتی ئینگلیز بۆ ئەوەی موسڵمانان چەواشە بکەن و ناچاری گوێڕایەڵی بێباوەڕە داگیرکارەکانیان بکەن[(١)].

دەسەڵاتداران سێ جۆرن: یەکەم: دەسەڵاتداری موسڵمانی دادگەر، پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت و هاوکاری بکرێت و نزای خێری بۆ بکرێت.

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٧٧).



دووەم: دەسەڵاتداری موسڵمانی ستەمکار و تاوانبار، ئارامی لەسەر دەگیرێت و لە چاکەدا گوێڕایەڵی دەکرێت، زانایان کۆڕان دروست نییە بەرهەڵستی بکرێت و دەرچوون بکرێت لە دەسەڵاتی.

سێیەم: دەسەڵاتداری بێباوەڕ کە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا هەبێت لەسەر بێباوەڕی، و توانا و هێز هەبێت بۆ لادانی بە کەمترین زیان پێویستە لەسەر کار لابدرێت و هەوڵ بدرێت موسڵمانێکی دادگەر لە شوێنەکەی دابنرێت.

هەموو ئەو نەهامەتی و دەردەسەریانەی ئەمڕۆ لە دونیای موسڵماناندا بەرجەستەیە، بەرهەمی فیکری خەوارجەکانە کە هەڵپەی کورسی و دەسەڵات دەکەن، لەو پێناوەشدا ئامادەن گرەو لەسەر ئایین و خوێن و خاك و نیشتیمانی موسڵمانان بکەن، چارەنووسی کردەوە ناعەقڵانیەکانیشیان چی دەبێت گرنگ نییە بە لایانەوە، لەبەر ئەوە زانایانی موسڵمان لە سەردەمی خەلیفەی ڕاشیدی موسڵمانان عوسمانەوە ﵁ کە بە دەستی ئەو خەوارجە خوێنڕێژە دونیا ویستانە زۆر نامرۆڤانە و دوور لە هەموو بەهاکانی ئاین لە ماڵەکەی

خۆیدا بە ناڕەوا شەهیدیان کرد، گرنگییەکی زۆریان بە پرسی دەسەڵات و دەسەڵاتداران داوە، پاڵپشت بەو ئایەت و فەرموودانە ئەو باسەیان بە درێژی باس کردووە، لای ئەهلی سوننەت ڕوون و ئاشکرایە کە دەرچوون لە دەسەڵاتداران پێچەوانەی ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە، لە کتێبەکانی بیروباوەڕدا ئەو باسە زۆر بە درێژی باس کراوە.

ئەلبانی دەڵێت: ئیبن ئەبوالعز دەڵێت: پێویستە گوێڕایەڵی دەسەڵاتداران بکرێت ئەگەر ستەمکاریشبن، چونکە خروجکردن لە گوێڕایەڵیان خراپەی چەند هێندەی ستەمی کاربەدەستانە، بەڵکو ئارامگرتن لەسەر ستەمیان هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانە، چونکە خوا ﷻ بالادەستی نەکردوون بەسەرمانەوە بەهۆی خراپی کردەوەکانمانەوە نەبێت، و پاداشتیش لە ڕەگەزی کردارە (الجزاء من جنس العمل)، پێویستە لەسەرمان هەوڵ بدەین و داوای لێخۆشبوونی تاوانەکانمان بکەین و تەوبە بکەین و کردەوەی باش ئەنجام بدەین، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠﴾(الشُّورَىٰ).



واتە: هەرچی کارەسات و ناڕەحەتییەك کە تووشتان دەبێت لە ئاینتان یان لە ژیانتان، بە هۆی کردەوەکانی خۆتانەوەیە، خوا لە زۆرێك لە تاوان و خراپەکانتان دەبورێت و سزاتان نادات لەسەریان.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ١٢٩﴾(الأَنعَام).

واتە: بەوشێوەیە ستەمکاران هەندێکیان دەکەین بە پشتیوان و سەرخەری هەندێکی تریان، بە هۆی ئەو کردەوە چەپەڵانەوە کە ئەنجامیان دەدا.

ئەگەر خەڵك دەیانەوێت لە ستەمی کاربەدەستان ڕزگاریان بێت، دەبێت خۆیان واز لەستەمکردن بهێنن.

دەڵێم: ئەمە ڕوونکەرەوەی ڕێگای ڕزگاربوونە لە ستەمی کاربەدەستان کە: ((مِنْ جِلْدَتِنا، يَتَكَلَّمُونَ بألسنتِنا))، واتە: خزم و کەس، و هاوزمانی خۆمانن، ئەو ڕێگایەش بریتییە لە تەوبەکردن و گەڕانەوەی موسڵمانان بۆ لای پەروەردگاریان و ڕاستکردنەوەی

بیروباوەڕیان و پەروەردەکردنی خۆیان و خێزانەکانیان لەسەر ئیسلامی صەحیح، بۆ ئەوەی ئەو فەرموودەیەی خوا ﷻ جێبەجێ بکەن کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ ﴿١١﴾﴾(الرَّعْد).

واتە: بێگومان خوا نازونیعمەتی هیچ گەلێك ناگۆڕێت هەتاکو بە نەفسی خۆیان نەیگۆڕن.

ڕێگای ڕزگاربوون بریتی نییە لەوەی بە خەیاڵی هەندێکدا دێت، بە شۆڕشکردن بە چەك دژی کاربەدەستان، و بە ڕێگای کودەتای سەربازی، ئەوە پێچەوانەیە لەگەڵ دەقەکانی شەریعەت، کە فەرمان دەکات بە گۆڕینی ئەوەی لە نەفسدایە، هەروەها دەبێت بنەڕەتەکە چاك بکرێت بۆ ئەوەی بینای لەسەر بکرێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾﴾(الحَجّ).

واتە: بە دڵنیاییەوە خوا ئەو کەسانە سەردەخات کە لە پێناویدا دەجەنگن، بێگومان خوا زۆر بەهێز و بەتوانا و دەسەڵاتە[١].

و دەسەڵات بە یەکێك لەم ڕێگایانە دەگیرێتە دەست، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: خیلافەت پۆستێکی گەورەیە، و بەرپرسیاریەتییەکی زۆر مەزنە، گرتنە دەستی ئیشوکاری موسڵمانانە، بەشێوەیەك ئەو بەرپرسی یەکەم بێت، و ئەمە فەرزی کیفایەیە، چونکە ئیشوکاری خەڵك بە کاربەدەست نەبێت بەڕێوە ناچێت، و خیلافەت بە یەکێك لەم سیٚ ڕێگایە بە دەست دێت:

یەکەم: دیاریکردنی لە لایەن خەلیفەی پێشووەوە وەك خیلافەتی عومەری کوڕی خەتاب ﵁ کە بە وەسیەتی ئەبوبەکر بوو ﵁ .

دووەم: کۆبوونەوەی ئەهلی (الحل والعقد) لەسەر کەسێك، ئەگەر لە لایەن خەلیفەی پێشووەوە دیاریکرابن وەك خەلافەتەکەی عوسمان ﵁ ، چونکە لە کۆبوونەوەی ئەهلی (الحل و العقد) کە دیاری کرابوون

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٧٧-٧٩).

لە لایەن عومەرەوە ﷺ، و ئەگەر دیاریش نەکرابن وەك خەلافەتەکەی ئەبوبەکر ﷺ لەسەر بۆچوونێك، و خەلافەتەکەی عەلی ﷺ.

سێیەم: گرتنە دەستی خەلافەت بە هێز و زاڵبوون وەك خەلافەتەکەی عبدالملکی کوڕی مەروان کاتێك ئیبن زوبێری کوشت، و بوو بە خەلیفە[(١)].

و مەرج نییە هەموو کەسێك بەیعەتی بداتێ، و ئەگەر پێچەوانەی فەرمانی کرد بڵێت: من بەیعەت لە گەردنمدا نییە بۆ ئەم خەلیفەیە، نەوەوی دەڵێت: زانایان کۆڕان مەرج نییە بۆ صەحیحی بەیعەت هەموو خەڵك، و هەموو ئەهلی حەل و عەقد بەیعەت بدەن، بەڵکو مەرجە ئەو زانا و سەرکردە و پێشەوایانەی خەڵك دەتوانرێت کۆ بکرێنەوە بەیعەت بدەن... و واجب نییە لەسەر هەموو کەسێك بچێت بۆ لای کاربەدەستەکە و دەستی بخاتە نێو دەستی، بەڵکو پێویستە لەسەری ملکەچی بێت، نارەزای دەرنەبڕێت، و سەرپێچی نەکات و گوێڕایەڵ بێت[(٢)].

(١). (مجموع فتاوى)(٨٧/٥).
(٢). (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(٧٧/١٢).

جێگەی باسە کەس لە زانا موعتەبەرەکانی ئیسلام باسی ئەوەیان نەکردووە دیموکراتییەت ڕێگایەکە لە ئیسلامدا بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات، چونکە دیموکراتییەت وەك خاوەنەکانی پێناسەی دەکەن حوکمی گەلە، دەبێت کاربەدەست بە حەزوئارەزووی گەلەکەی هەڵسوکەوت بکات، و ئەگەر فەرمانێك دەربکات دەتوانن نارەزای دەرببڕن و پێی بگۆڕن، بەڵام کاربەدەست لە ئیسلامدا دەبێت گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بکات و دوور کەوێتەوە لە قەدەغەکراوەکانی، و نابێت گوێڕایەڵی دەسەڵاتدارەکەیان بکەن ئەگەر سەرپێچی فەرمانی خوای کرد، و کاربەدەست نابێت بە حەزوئارەزووی گەلەکەی بکات ئەگەر ویستی شتێکیان هەبوو پێچەوانەی شەریعەتی خوا بێت.

و پێویستە لەسەر موسڵمانان خێر و چاکەی کاربەدەستەکەیان بوێت دڵسۆزبن و ئامۆژگاری بکەن، مسلم لە تەمیمی دارییەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الدِّينُ النَّصِيحَةُ قُلْنا: لِمَن؟ قالَ: لِلَّهِ ولِكِتابِهِ ولِرَسُولِهِ ولِأئِمَّةِ المُسْلِمِينَ وعامَّتِهِمْ)).

واتە: ئاین دڵسۆزی و ئامۆژگارییە، گوتمان: بۆ کێ؟ فەرمووی: بۆ خوا ﷻ و کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی ﷺ و کاربەدەستانی موسڵمانان و هەموو موسڵمانان بە تێکڕا.

و مانگرتن و خۆپیشاندان و ناڕەزایەتی دەربڕین بۆ گەیاندنی پەیام بە کاربەدەستان پێچەوانەی ئەو بنەمایەیە لای ئەهلی سوننەت کە پێویستە گوێڕایەڵی کاربەدەستان بکرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای ئامۆژگاری کردنی کاربەدەستانی دیاری کردووە، ئیبن ئەبوعاصم لە عیازی کوڕی غەنەمەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن أرادَ أنْ يَنْصَحَ لِذِي سُلْطانٍ فِي أمْرٍ فَلا يُبْدِهِ عَلانِيَةً، ولَكِنْ لِيَأْخُذْ بِيَدِهِ، فَيَخْلُو بِهِ، فَإنْ قَبِلَ مِنهُ فَذاكَ، وإلّا كانَ قَدْ أدّى الَّذِي عَلَيْهِ لَهُ)).

واتە: ئەگەر کەسێك ویستی ئامۆژگاری دەسەڵاتدارێك بکات، بە ئاشکرا دەرینەبڕێت، بەڵکو دەستی بگرێت و بە تەنها لەگەڵیدا دابنیشێت، ئەگەر ئامۆژگارییەکەی لێ وەرگرت باشە، ئەگەرنا ئەوەی پێویست بووە لەسەری بەجێی هێناوە.

و ئەبوداود و ترمزی و ئیبن ماجە لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی ئەبوداودە و ئەلبانی بە صحیح لغیرە داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أفْضَلُ الجِهادِ كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ سُلْطانٍ جائِرٍ أوْ أميرٍ جائرٍ)).

واتە: باشترین جیهاد وشەیەکی حەقە لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار یان ئەمیرێکی ستەمکار.

مسلم لە ئوسامەی کوڕی زەیدە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((قِيلَ لَهُ: ألا تَدْخُلُ عَلى عُثْمانَ فَتُكَلِّمَهُ؟ فَقالَ: أتَرَوْنَ أنِّي لا أُكَلِّمُهُ إلّا أُسْمِعُكُمْ؟ واللهِ لَقَدْ كَلَّمْتُهُ فِيما بَيْنِي وبَيْنَهُ، ما دُونَ أنْ أفْتَتِحَ أمْرًا لا أُحِبُّ أنْ أكُونَ أوَّلَ مَن فَتَحَهُ)) وفي لفظ البخاري: ((إنَّكُمْ لَتَرَوْنَ أنِّي لا أُكَلِّمُهُ إلاّ أُسْمِعُكُمْ، إنِّي أُكَلِّمُهُ في السِّرِّ)).

واتە: پێی گوترا: بۆچی ناچیت بۆ لای عوسمان رضي الله عنه قسەی لەگەڵدا بکەیت؟ لە وەڵامدا گوتی: وادەبینن من قسەی لەگەڵدا ناکەم هەتاکو ئێوە نەیبیستن، سوێندبێت من لە نێوان خۆم و ئەودا قسەم کردووە، بەبێ ئەوەی دەرگای کارێك بکەمەوە کە من پێم خۆش نییە

یەکەم کەسبم کە ئەو دەرگایە دەکەمەوە، من بە نهێنی قسەی لەگەڵدا دەکەم.

ئیبن ڕەجەب دەڵێت: سەلەف ئەگەر بیانویستایە ئامۆژگارییەکی کەسێ بکەن بە نهێنی ئامۆژگارییان دەکرد، هەتاکو هەندێکیان دەڵێن: هەرکەسێك لە نێوان خۆی و براکەیدا ئامۆژگاری بکات ئەوە ئامۆژگارییە، و هەرکەسێك بە پێش چاوی خەڵکەوە ئامۆژگاری بکات ئەوە سەرزەنشتی کردووە[(١)].

کەواتە: ڕێگای نکولی کردن و ئامۆژگاری کردنی دەسەڵاتداران لەسەر شەقام و مینبەری مزگەوتەکان و کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە نییە، بەڵکو ڕێگای دروست ئەوەیە بچێت بە تەنها قسەی لەگەڵدا بکات، لەوانەیە کەسانێك بڵێن: ئێمە دەستمان ناگات بە دەسەڵاتداران یان ڕێگامان نادەن بچین بۆ لایان هەتاکو پەیامی خۆمانیان پێ بگەیەنین، ئەو کاتە ئەو واجبە لەسەر تۆ کەوتووە، لای خوا تاوانبار نابیت، بەڵکو لە دڵەوە ئەگەر خراپەیەك هەبوو پێت ناخۆش دەبێت.

---

(١). (جامع العلوم والحكم)(٢٢٥/١).



## جیهاد و تێکۆشان دەمێنێت هەتاکو ڕۆژی قیامەت

**(والغزو مَاض معَ الإِمَام إِلَى يَوْم الْقِيَامَة الْبر والفاجر لَا يتْرك).**

**واتە: غەزاکردن لەگەڵ کاربەدەستی چاکەکار و خراپەکار بەردەوامە هەتاکو ڕۆژی قیامەت، و وازی لێناهێنرێت.**

غەزا کردن و تێکۆشان یەکێکی ترە لە پێویستییەکانی گوێڕایەڵی دەسەڵاتداران، زەید مەدخەلی دەڵێت: واجبە لەسەر هەرکەسێك کاربەدەست بانگی بکات بۆ جیهاد و تێکۆشان وەڵامی بانگەوازەکەی بداتەوە، ئەو کاربەدەستە چاکەکاربێت یان خراپەکار...ئەمە هەڵویستی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە لە کاربەدەستان ئەگەر ستەمکاریشبن، و ئەگەر چاکەکاربن لە پێشترن هاوکاری بکرێن لە چاکە و لە خودا ترساندا[1].

بوخاری لە صەحیحەکەیدا بابەتێکی هێناوە لە ژێر ناوی: (بابٌ: الجِهادُ ماضٍ مَعَ البَرِّ والفاجِرِ).

---

(١). (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)(١٣٥-١٣٦).

## دابەشکردنی دەستکەوتەکانی و جێبەجێ کردنی حەدەکان

**(وَقِسْمَةَ الْفَيْءِ وَإِقَامَةَ الْحُدُود إِلَى الْأَئِمَّة مَاض لَيْسَ لأحد أَن يطعن عَلَيْهِم وَلَا ينازعهم).**

**واتە: دابەشکردنی دەستکەوتەکان و جێبەجێ کردنی حەدەکان بۆ کاربەدەستان بەردەوامە، کەس بۆی نییە تانەیان لێ بدات و کێشە و ناکۆکییان لەگەڵدا بکات.**

ئەمەش کە ئیمام ئەحمەد باسی کردووە بۆ دەسەڵاتەکانی کاربەدەستانە، و بۆ تاك بە تاکی موسڵمانان نییە، کەس بۆی نییە سامان و دەرامەتی دەوڵەت کۆ بکاتەوە و بەکاری بهێنێت بە ویستی خۆی، ئەوە زۆر خراپە و گەندەڵی و خراپەی لێدەکەوێتەوە، ئێستا زۆر بە ئاشکرا دیارە ئەو کەسانەی کە سامانی دەوڵەت بۆ خۆیان دەبن دەبنە هۆکاری ئەوەی کۆمەڵی چەکدار و دەست و پێوەند پەیدا بکەن و حیزب و تاقمی جیاجیا دابمەزرێنن و سەرپێچی فەرمانەکانی دەوڵەت بکەن و ملکەچ نەبن و خۆیان لەسەرووی ڕێسا و حوکمەکانەوە دەبینن، بەوەش خراپە و گەندەڵی و پیسخۆری زۆر پەیدا دەبێت، و بۆ کەس

نییە ڕێگری بکات لە کاربەدەستان بۆ پیادەکردنی ئەو حوکمانە، هەروەها سەپاندنی حەد و سزاکان بەسەر سەرپێچیکاراندا، ئەمەش تەنها دەسەڵاتی کاربەدەستان و دەوڵەتە و کەس بۆی نییە لای خۆیەوە بۆ نموونە حەدی کوشتن یان دەست بڕین و ڕەجمکردنی زیناکار جێبەجێ بکات، ئەگەرنا پاشاگەردانی و بێسەروبەری و خراپە تەشەنە دەکات، ئەگەر بینرا کاربەدەستان بەرژەوەندی خۆیان و کەسوکاریان ڕەچاو دەکەن و بەرژەوەندی موسڵمانیان بەلاوە گرنگ نییە، لە شەرعدا ڕێگا چارەی ئەمەش دیاریکراوە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ سائِلُهُمْ عَمّا اسْتَرْعاهُمْ)).

واتە: ئەوەی مافی ئەوانە لەسەرتانە بەجێی بهێنن، خواش پرسیاری ئەو مافانەی خەڵکیان لێ دەکات کە لە ئەستۆیانە.

و لە ئیبن مەسعودەوە رضي الله عنه پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سَتَكُونُ أَثَرَةٌ وأُمُورٌ تُنْكِرُونَها قالُوا: يا رَسُولَ اللَّهِ فَما تَأْمُرُنا؟ قالَ: تُؤَدُّونَ الحَقَّ الَّذِي عَلَيْكُمْ، وتَسْأَلُونَ اللَّهَ الَّذِي لَكُمْ)).

واتە: دوای من خۆ ویستی و کۆمەڵە کردەوەیەك دەبینن کە پێتان ناخۆش دەبێت، گوتیان: بەچی فەرمانمان پێدەکەی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: مافەکانی ئەوان بدەن، و داوای مافی خۆتان لە خوا بکەن.

ئیبن عوسەیمین لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە هەواڵی لەبارەی کارێکەوە داوە کە واقعە، چونکە خەلیفەکان و کاربەدەستان زۆر دەمێکە سامان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاردەهێنن، دەیانبینین زیادەڕۆی دەکەن لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و خانوو و سوارییەکانیان، سامانی خەڵك بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بە کاردەهێنن، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە گوێڕایەڵییان نەکەین، و بەرهەڵستیان بکەین، بەڵکو داوای مافەکانم لە خوا ﷻ دەکەین، و ئەو ئەرکانەی لە ئەستۆمانە بەجێیان دەهێنین[1].

(١). (شرح رياض الصالحين)(٢١٩/١).



## زەکات دانە دەستی کاربەدەستان

**(وَدفع الصَّدقَات إِلَيْهِم جَائِزَة نَافِذَة من دَفعهَا إِلَيْهِم أَجْزَأت عَنهُ براً كَانَ أَو فَاجِرًا).**

**واتە: دروستە زەکاتیان بدرێتیٚ، هەرکەسێك بیداتە دەستیان لەسەری دەکەوێت، کاربەدەستان چاکەکاربن یان خراپەکار.**

عوبێد جابری دەڵێت: ئەمە تایبەتمەندی چوارەمی کاربەدەستانە لە (دفع الصدقات) زەکاتی فەرزە، و زەکاتی سامانەکان دوو جۆرە:

یەکەم: ئەوەی دەدرێت بەکاربەدەست یان نوێنەریان لە شارەکان و ئەو فەرمانبەرانەی دەگەڕێن و سامانی زەکات کۆ دەکەنەوە، لە ماڵەکانیان و شوێنی کارەکانیان.... ئەوەی کاربەدەست زەکاتی کۆ دەکاتەوە زەکاتی ئەو ئاژەڵ و مەڕوماڵاتانەیە کە لە لەوەڕگا دەلەوەڕێن، و زەکاتی بەروبووم و دانەوێڵە، ئەگەر کاربەدەست کۆی کردەوە نادرێتە دەستی کەسی تر.

دووەم: زەکاتی ئەو سامانانەی بە خاوەنەکەی دەسپێردرێت، زەکاتی کاڵای بازرگانی و خشڵی ئافرەت و پارەیە لەسەر بۆچوونی صەحیح ، خاوەنەکانیان زەکاتی دەردەکەن و دابەشی دەکەن بەسەر ئەو هەشت چینەی زەکاتیان پێدەرێت، بەڵام ئەگەر کاربەدەست لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ کۆکردنەوەی، پێویستە لەسەرمان وەڵامیان بدەینەوە و زەکاتەکانیان بدەینێ[1].

(١). (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)(١٣٢/١٣١).



## نوێژی هەینی لە پشتی کارمەندەکانی دەوڵەتەوە

**(وَصَلَاة الْجُمُعَة خَلفه وَخلف من ولاه جَائِزَة تَامَّة رَكْعَتَيْنِ من أعادهما فَهُوَ مُبْتَدع، تَارِك للآثار مُخَالف للسّنة لَيْسَ لَهُ من فضل الْجُمُعَة شَيْء، إِذا لم ير الصَّلَاة خلف الْأَئِمَّة من كَانُوا برهم وفاجرهم، فَالسنة بِأَن يُصَلِّي مَعَهم رَكْعَتَيْنِ وَتَدين بِأَنَّهَا تَامَّة، ولَا يكن فِي صدرك من ذَلِك شَك).**

**واتە: نوێژی هەینی لە دوای ئەو کاربەدەستەوە و ئەوەی ئەو دایدەنێت دروستە و تەواوە و دوو ڕکاتە، هەرکەسێك نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە موبتەدعە، و پێچەوانەی ئەسەرەکانی کردووە و پێچەوانەی سوننەتە، و هیچ لە فەزڵی هەینییەکەی دەست ناکەوێت، ئەگەر نوێژ لە دوای ئەو ئیمامانەوە بە دروست نەزانێت چاکەکار و خراپەکاریان، سوننەتە نوێژیان لەگەڵدا بکرێت دوو ڕکات و باوەڕت وابێت نوێژەکەت تەواوە، و لە دڵتدا هیچ گومانێکت نەبێت.**

ئەمەش مافێکی ترە لە مافەکانی کاربەدەستی موسڵمان و پێویستە لەسەریان گوێڕاڵییان بکەن، ئێستا کەسانێك پەیدابوون لە مزگەوتەکان

لە دوای پێش نوێژەکانەوە نوێژ ناکەن دەیانبینی یان لە مزگەوت دەردەچن ئەگەر پێش نوێژەکە لەسەر حەزوئارەزوویان نەبێت، یان بە تەنها نوێژ دەکەن و لەگەڵ موسڵماناندا نوێژ ناکەن، ئەو کەسانە کاریگەرن بە هاوشێوەی ئەم جۆرە قسانەی سەید قوتبە کە لە تەفسیری ئایەتی: ﴿وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ ﴾(يُونُس)دا دەڵێت: خوا ڕێنمایمان دەکات بۆ وازهێنان لە پەرستگاکانی نەفامی، و بۆ ئەوەی ماڵی کۆمەڵی موسڵمانان بکرێتە مزگەوت، کە هەست بە گۆشەگیری بکەیت دوور لە کۆمەڵگەی نەفامی. (في ظلال القران)(١٨١٦).

قورتبی لە تەفسیری ﴿وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ﴾ دا دەڵێت: زۆربەی ڕاڤەکاران دەڵێن: نەوەکانی ئیسرائیل لە مزگەوت و کەنیسەکانیان نەبووایە نوێژیان نەدەکرد کە دیار وئاشکرا بوون، کاتێك پێغەمبەر موسا عليه السلام بوو بە پێغەمبەر، فیرعەون فەرمانی کرد هەموو مزگەوتەکانی نەوەکانی ئیسرائیل بڕوخێنن و نوێژ ئەنجامدانیان لێ قەدەغە بکەن، خوا سروشی کرد بۆ پێغەمبەر موسا و هارونی برای کە

کۆمەڵە خانوویەك لە میسر بۆ گەلەکەتان دروست بکەن، کە مەبەست مزگەوتە نەوەك خانوو بۆ ژیان، ئەمە بۆچوونی ئیبن عەباس و ئیبراهیمی کوڕی زەید و ڕەبیع و ئەبومالك و جگە لەوانیشە، و ڕیوایەت کراوە لە ئیبن عەباس و سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە کە ئەم ئایەتە مانای ئەوەیە: خانووەکانتان ڕووبەڕووی یەکبن، بەڵام بۆچوونی یەکەم پەسەندترە[١].

زەید مەدخەلی دەڵێت: ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماتە کە کۆمەڵی ڕزگاربوون، بە پێچەوانەی خەوارجەکان کە وادەبینن لە پشتی کاربەدەستانەوە نوێژ ناکرێت ئەگەر ستەم و نادادیان تێدا بێت، بەڵکو تەکفیرییان دەکەن و هەرگیز نوێژ لە پشتیانەوە بە دروست نازانن، هەروەها ڕەوافزەکان کە نوێژی هەینی دەکەن، دوای ئەوە ڕاستەوخۆ نوێژی نیوەڕۆ دەکەن[٢]؛ و ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئەگەر مومکن بێت نوێژی هەینی و جەماعەتەکان لە پشتی کەسێکی چاکەکارەوە ئەنجام بدرێت باشترە لەوەی لە پشتی کەسێکی خراپەکارەوە ئەنجام

(١).(الجامع لأحكام القرآن)(٣٧١/٨).
(٢). (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)(١٤٧).

بدرێت.... بەڵام ئەگەر مومكن نەبوو و پێویست بوو نوێژی لە پشتەوە بكات وەك نوێژی هەینی نوێژەكە دووبارە ناكاتەوە و دووبارە كردنەوە لە كرداری ئەهلی بیدعەیە[١]؛ و بوخاری لە صەحیحەكەیدا بابەتێكی هێناوە (بابُ إمامَةِ المَفْتُونِ والمُبْتَدِعِ)، و ئەسەرێكی لە حەسەنی بەصرییەوە هێناوە كە پرسیاری لێكراوە سەبارەت بە نوێژ لە پشتی كەسی موبتەدعەوە دەڵێت: (صَلِّ وعَلَيْهِ بِدْعَتُهُ)، واتە: نوێژی لە پشتەوە بكە و بیدعەكەی لەسەر خۆیەتی.

و لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أصابُوا فَلَكُمْ، وإنْ أخْطَئُوا فَلَكُمْ وعَلَيْهِمْ)).

واتە: ئیمامەكان نوێژتان بۆ دەكەن ئەگەر حەقیان پێكا چاكەیان دەست دەكەوێت و ئێوەش پاداشتتان دەست دەكەوێت، و ئەگەر هەڵە بكەن لە ئەستۆی خۆیانە و ئێوە پاداشتی خۆتتان دەست دەكەوێت.

(١). (مجموع الفتاوى)(٣٤٤/٢٣).



## دەرچوون لە دەسەڵاتی کاربەدەستان

**(وَمن خرج على إِمَام من أَئِمَّة الْمُسلمين وَقد كَانُوا اجْتَمعُوا عَلَيْهِ وأقروا بالخلافة بِأَيّ وَجه كَانَ بِالرِّضَا أَو الْغَلَبَة فقد شقّ هَذَا الْخَارِج عَصا الْمُسلمين وَخَالف الْآثَار عَن رَسُول الله ﷺ فَإِن مَاتَ الْخَارِج عَلَيْهِ مَاتَ ميتَة جَاهِلِيَّة).**

**واته: هەرکەسێك لە پێشەوایەك لە پێشەواکانی موسڵمانان دەربچێت، لە کاتێکدا خەڵك لەگەڵیدا کۆبوونەوە و دانیان نابێت بەوەی بووەتە خەلیفەیان بە هەرجۆرێك بێت بە ڕەزامەندی یان بە زاڵبوون بەسەریاندا، ئەو کەسەی دەرچووە ڕیزی موسڵمانانی کەرت کردووە و پێچەوانەی ئاسارەکانی کردووە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەت کراوە، ئەگەر ئەو کەسە بمرێت مردنێکی نەفامی مردووە.**

بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیانکردووە دەڵێت:
((مَن كَرِهَ مِن أميرِهِ شَيْئًا، فَلْيَصْبِرْ عَلَيْهِ، فَإنَّهُ لَيْسَ أحَدٌ مِنَ النّاسِ خَرَجَ مِنَ السُّلْطانِ شِبْرًا، فَماتَ عَلَيْهِ، إلّا ماتَ مِيتَةً جاهِلِيَّةً)).

واتە: هەرکەسێك لە بەرپرسەکەی شتێکی بینی پێی ناخۆش بوو، ئارامی لەسەر بگرێت، چونکە بێگومان هەرکەسێك لە کاربەدەستەکەی بستێك دەربچێت، و لەسەر ئەوە بمرێت، دەمرێت مردنێکی نەفامی.

نەوەوی لە بابەتی پێویستی گوێڕایەڵی کاربەدەستان لە جگە لە سەرپێچی فەرمانی خوا، و حەرامی گوێڕایەڵییان لە سەرپێچی فەرمانی خوادا، دەڵێت: زانایان کۆڕان لەسەر واجبی گوێڕایەڵی، قازی عیاز و جگەلەویش ئەم کۆڕاییەیان باسکردووە، پاشان دەڵێت: دەرچوون لە دەسەڵاتیان و جەنگان لەگەڵیان حەرامە بە کۆڕای موسڵمانان، ئەگەر فاسق و ستەمکاریشبن، و فەرموودەی زۆر هاتووە لەسەر ئەوەی کە باسکرا، و ئەهلی سوننەت کۆڕان کاربەدەست لەبەر فاسقی لەسەر کار لا نابرێت[١].

بوخاری و مسلم لە ئەبوهریرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن خَرَجَ مِنَ الطّاعَةِ، وفارَقَ الجَماعَةَ فَماتَ، ماتَ مِيتَةً جاهِلِيَّةً)).

---

(١). بڕوانە: (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)(٢٢٩.٢٢٢/١٢).

واتە: هەرکەسێك لە گوێڕایەڵی دەربچێت، و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بێتەوە و بمرێت، مردنێکی نەفامی مردووە.

ئیبن بەتال لەسەر فەرموودەی پێشوو دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ وازهێنان لە دەرچوون لە دەسەڵاتدار ئەگەر ستەمیش بکات، و فەقیهەکان کۆڕان لەسەر ئەوە، و واجبە گوێڕایەڵی دەسەڵاتداری زاڵبوو بکرێت و جیهاد لەگەڵ بکرێت، و گوێڕایەڵی باشترە لە دەرچوون لە دەسەڵاتی، لەبەر نەڕشتنی خوێن، و هێوەرکردنەوەی عامەی خەڵك، و بەڵگەیان ئەم فەرموودەیە و ئەوانی ترە لەسەر ئەم بابەتە، و هیچ دەسەڵاتدارێکیان هەڵاوێر (استثناء) نەکردووە دەسەڵاتدارێك نەبێت تووشی کوفری ڕاشکاو بوو بێت، ئەو کاتە گوێڕایەڵی واجب نییە، بەڵکو جیهادی لە دژ دەکرێت بۆ هەرکەسێك کە تونای هەبێت[(١)].

و محمدی کوڕی عبدالوهاب دەڵێت: پێشەواکان لە هەموو مەزهەبەکان کۆڕان لەسەر ئەوەی ئەگەر کاربەدەستێك زاڵ بێت بەسەر

(١). (فتح الباري)(١٣/٧).



وڵاتێكدا یان چەند وڵاتێكدا حوكمی كاربەدەستی هەیە لە هەموو شتێكدا[1].

جێگەی ئاماژە پێدانە هەندێك لە زانایان دەرچوونیان لە دەسەڵاتداران بۆ دوو بەش دابەشكردووە، یەكەم: دەرچوون بە چەك، ئەو بەڵگانەی كە باسكران هەموویان بەڵگەن لەسەر حەرامی و خراپی ئەم جۆرە دەرچوونە.

دووەم: دەرچوون بە هاندان و قسەكردن، و نوسین، زانایان پێیان گوتوون: (الخوارج القعدية)، ئیبن حەجەر دەڵێت: (القعدية) ئەو كەسانەن دەرچوون لە دەسەڵاتدارانی موسڵمانان دەڕازێننەوە بۆ خەڵك، و خۆیان بەو كارە هەڵناستن، ئەمە قسەی مبەڕەدە[2].

و ئەبوداود لە عبداللەی كوڕی محمدی كوڕی زەعیفەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: (قَعَدَ الخَوارِجُ هُمْ أخْبَثُ الخَوارِجِ)[3].

---

(١). (الدرر السنية)(٥/٩).
(٢). (الإصابة في تمييز الصحابة)(٢٣٢/٥).
(٣). (مسائل الإمام أحمد)(٣٦٢٩.

بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی بوخارییە دەڵێت: ((بُعِثَ إلى النبيِّ ﷺ بشيءٍ فَقَسَمَهُ بيْنَ أرْبَعَةٍ، وقالَ: أتَأَلَّفُهُمْ، فَقالَ رَجُلٌ: ما عَدَلْتَ، فَقالَ :يَخْرُجُ مِن ضِئْضِئِ هذا قَوْمٌ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ..)).

واتە: شتێك نێردرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەشی کرد بەسەر چوار کەسدا، و فەرمووی: دڵیان ڕادەگرم، پیاوێك گوتی: دادگەر نەبوویت، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: لە نەوەی ئەمە کەسانێك پەیدا دەبن لە ئاین دەردەچن.

ئیبن عوسەیمین لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئەمە گەورەترین بەڵگەیە کە دەرچوون لە دەسەڵاتداران بە شمشێر و بە قسەشە، ئەم کەسە شمشێری لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەگرت بەڵکو نکولی لێکرد، ئەوەی لە هەندێك کتێبی ئەهلی سوننەتدا دەبینین دەڵێن: دەرچوون لە دەسەڵاتی کاربەدەست بە شمشێرە، مەبەستیان دەرچوونی کۆتاییە[1].

---

(١). (التعليق على رسالة رفع الأساطين)(٣٣).



## جەنگان لەگەڵ كاربەدەستان

**(وَلَا يحل قتال السُّلْطَان وَلَا الْخُرُوج عَلَيْهِ لأحد من النَّاس فَمن فعل ذَلِك فَهُوَ مُبْتَدع على غير السّنة وَالطَّرِيق).**

**واتە: دروست نییە شەڕ بكرێت لەگەڵ دەسەڵاتداران و دەرچوون لێیان بۆ هیچ كەس لە خەڵك، هەركەسێك ئەوە بكات موبتەدعە و لەسەر سوننەت و ڕێگای ڕاست نییە.**

مسلم لە حوزەیفەی كوڕی یەمانەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((يَكونُ بَعْدِي أئِمَّةٌ لا يَهْتَدُونَ بهُدايَ، ولا يَسْتَنُّونَ بسُنَّتِي، وسَيَقُومُ فيهم رِجالٌ قُلُوبُهُمْ قُلُوبُ الشَّياطِينِ في جُثْمانِ إنْسٍ، قالَ: قُلتُ: كيفَ أصْنَعُ يا رَسولَ اللهِ، إنْ أدْرَكْتُ ذلكَ؟ قالَ: تَسْمَعُ وتُطِيعُ لِلأَمِيرِ، وإنْ ضُرِبَ ظَهْرُكَ، وأُخِذَ مالُكَ، فاسْمَعْ وأَطِعْ)).

واتە: دوای من كۆمەڵە دەسەڵاتدارێك پەیدا دەبن، بە هیدایەتی من هیدایەت وەرناگرن، و سوننەتی من ڕەچاو ناكەن، و كەسانێكی بەرپرس سەرهەڵدەدەن دڵیان دڵی شەیتانەكانە لە لەشی مرۆڤدا، دەڵێت: گوتم:



چی بکەم ئەگەر گەیشتمە ئەو سەردەمە ئەی پێغەمبەری خوا؟، فەرمووی: دەبیستیت و گوێڕایەڵی کاربەدەست دەکەیت، ئەگەر لە پشتیدایت، و سامانیشی بردیت، ببیستە و گوێڕایەڵ بە.



## جەنگان لەگەڵ دز و چەتە

(وقتال اللُّصُوص والخوارج جَائِز إِذا عرضوا للرجل فِي نَفسه وَمَاله فَلهُ أَن يُقَاتل عَن نَفسه وَمَاله وَيدْفَع عَنْهَا بِكُل مَا يقدر عليه، وَلَيْسَ لَهُ إِذا فارقوه أَو تَرَكُوهُ أَن يطلبهم وَلَا يتبع آثَارهم لَيْسَ لأحد إِلَّا الإِمَام أَو وُلَاة الْمُسلمين، إِنَّمَا لَهُ أَن يدْفع عَن نَفسه فِي مقَامه ذَلِك وَيَنْوِي بِجهْدِهِ أَن لَا يقتل أحداً، فَإِن مَاتَ على يَدَيْهِ فِي دَفعه عَن نَفسه فِي المعركة فأبعد الله الْمَقْتُول.

وَإِن قتل هَذَا فِي تِلْكَ الْحَال وَهُوَ يدْفع عَن نَفسه وَمَاله رَجَوْت لَهُ الشَّهَادَة كَمَا جَاءَ فِي الْأَحَادِيث.

وَجَمِيع الْآثَار فِي هَذَا: إِنَّمَا أَمر بقتاله وَلم يُؤمر بقتْله وَلَا اتِّبَاعه وَلَا يُجِيز عَلَيْهِ إِن صرع أَو كَانَ جريحا وَإِن أَخذه أَسِيرًا فَلَيْسَ لَهُ أَن يقْتله وَلَا يُقيم عَلَيْهِ الْحَد وَلَكِن يرفع أمره إِلَى من ولاه الله فَحكم فِيهِ).

واتە: شەڕکردن لەگەڵ دزەکان و خەوارجەکان دروستە ئەگەر هاتنە ڕێگای کەسێك بۆ کوشتنی و بردنی سامانی، و بۆی هەیە بەرگری لە نەفسی خۆی و سامانی بکات، و بەرگری بکات بە هەرشتێك کە لە

توانایدایە، و بۆی نییە ئەگەر وازیان لێهێنا یان بەجێیان هێشت شوێنیان بکەوێت و بە دوایاندا بڕوات ئەوە بۆ کەس نییە جگە لە ئیمام و کاربەدەستان، بەڵکو تەنها بۆی هەیە بەرگری لە نەفسی خۆی بکات لەو شوێنەدا و بەو هەوڵەی نییەتی ئەوە بێت کەس نەکوژێت، ئەگەر کەسێك لەسەر دەستی مرد لە کاتێکدا بەرگری لە خۆی دەکات خوا کوژراوەکە لە ڕەحمی خۆی دوور بخاتەوە.

و ئەگەر ئەم کەسە بکوژرێت لەسەر ئەو حاڵەتەی کە بەرگری لە نەفسی و سامانی خۆی دەکات، ئومێدم هەیە شەهید بێت وەك لە فەرموودەدا هاتووە.

و هەموو فەرموودەکان لەوبارەیەوە: فەرمانی کردووە بە شەڕکردن لەگەڵیدا، و فەرمانی بە کوشتن و شوێنکەوتنی و لەناوبردنی ناکات ئەگەر بە بێ هۆشی یان بریندار دەستی کەوتن، و ئەگەر بە دیل گرتنی بۆی نییە بیکوژێت و حەدی لەسەر جێبەجێ بکات، بەڵکو کاری بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوانەی خوا دەسەڵاتی پێداون بۆ ئەوەی حوکمی لەسەر بدەن.

بوخاری و مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ((مَن قُتِلَ دُونَ مالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ)).

واتە: هەرکەسێك لەسەر سامانی بکوژرێت شەهیدە.

و ئەحمەد و ترمزی و نەسائی لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((من قُتِلَ دونَ مالِهِ فَهوَ شَهيدٌ، ومن قُتِلَ دونَ دمِهِ فَهوَ شَهيدٌ، ومن قتلَ دونَ أهلِهِ فَهوَ شَهيدٌ)).

واتە: هەرکەسێك لەسەر سامانی بکوژرێت شەهیدە، و هەرکەسێك لەسەر ئاینی بکوژرێت شەهیدە، و هەرکەسێك لەسەر خوێنی خۆی بەرگری بکات و بکوژرێت شەهیدە، و هەرکەسێك لەسەر ناموس و کەرامەتی کەسوکاری بکوژرێت شەهیدە.

و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ((جاءَ رَجُلٌ إلى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقالَ: يا رَسُولَ اللهِ، أرَأيْتَ إنْ جاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أخْذَ مالِي؟ قالَ: فَلا تُعْطِهِ مالَكَ، قالَ: أرَأيْتَ إنْ

قاتَلَنِي؟ قالَ: قاتِلْهُ، قالَ: أرَأيْتَ إنْ قَتَلَنِي؟ قالَ: فَأنْتَ شَهِيدٌ، قالَ: أرَأيْتَ إنْ قَتَلْتُهُ؟ قالَ: هُوَ فِي النّارِ)).

واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر كەسێك هات ویستی سامانەكەم ببات؟ فەرمووی: سامانی خۆتی مەدەرێ، گوتی: ئەگەر شەڕی لەگەڵ كردم؟ فەرموو: تۆش شەڕی لەگەڵ بكە، گوتی: ئەگەر كوشتمی؟ فەرمووی: تۆ شەهیدیت، گوتی: ئەگەر من ئەوم كوشت، فەرمووی: لە ئاگردایە.

ئەمە ئەگەر كەسێك یان كەسانێك بێنە سەرماڵ و شوێنی كار و سامانی، بۆی هەیە بەرگری لە خۆی بكات، بەڵام هەڵهاتن شوێنیان ناكەوێت و ئیشی دەسەڵاتدارانە، و ئەگەر بە بریندارى دەستی كەوتن دەبێت بیداتە دەستی كاربەدەستان بۆ ئەوەی ڕێوشوێنی پێویستی بەرامبەر بگرنەبەر، بۆ ئەوەی پاشاگەردانی دروست نەبێت.

ئیبن تەیمییە دەڵێت: سزای ئەو ڕێگر و چەتانەی بە چەك ڕێگا لە خەڵك دەگرن، بۆ ئەوەی ماڵ و سامانی خەڵك بە ئاشكرا ببەن... خوا بەو جۆرە كەسانە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ

وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣﴾(المَائِدَة).

واتە: بێگومان پاداشتی ئەو کەسانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی نانەوەی بشێوی و تێکدان دەدەن لەسەر زەوی ئەوەیە: بکوژرێن، یان لە خاچ بدرێن، یان دەست و پێیان بە چەپ و ڕاست ببڕدرێت، یان لەو سەر زەمینە دوور بخرێنەوە، ئەو کەسانە لە دونیا سەرشۆڕ و ڕیسوان، و لە دواڕۆژیشدا سزایەکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە.

ئیمامی شافعی: لە موسنەدەکەیدا لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەربارەی ڕێگر دەڵێت: ئەگەر خەڵکیان کوشت وماڵیشیان برد، کە گیران دەکوژرێن و لەخاچ دەدرێن، ئەگەر خەڵکیان کوشت و ماڵیان نەبرد دەکوژرێن و لە خاچ نادرێن، ئەگەر ماڵیان برد و خەڵیان نەکوشت ئەوە دەستێك و پێیەکیان بە چەپ و ڕاست دەبڕدرێت، ئەگەر ترسیان لەسەر ڕێگا دروست کرد نەفی دەکرێن و دوور دەخرێنەوە.

ئەوە گوتەی زۆربەی زانایانی وەك شافعی و ئەحمەدە، ئەو بۆچوونەش نزیکە لە گوتەی ئەبوحەنیفەوە، و هەیانە دەڵێن: بە دەستی کاربەدەستە، لە هەرکوێ بەرژەوەندی هەبوو دەیکوژێت، ئەگەر کەسیشی نەکوشتبێت، بۆ نموونە: ئەگەر سەرکردەی چەتەکان بوو و گوێڕایەڵیان دەکرد، دەست و پێی کەسانێك دەبڕێت کە بەرژەوەندی گشتی تێدابێت، بۆ نموونە: ئەگەر کەسێکی بەهێز و لێهاتوو و لێزان بوو لە بردنی ماڵی خەڵك، هەندێك زانای تر دەڵێن: ئەگەر ڕێگرێك ماڵی خەڵکی ببات دەکوژرێت و دەست و پێی دەبڕدرێت ولە خاچیش دەدرێت، بۆچوونی یەکەمیان گوتەی زۆربەی زانایانە، هەریەك لەو چەتە و ڕێگرانە کەسێکیان کوشتبێت، ئەوا کاربەدەستان دەیکوژن لە بری ئەو کەسەی کوشتوویەتی، وبە هیچ شێوەیەك نابێت لێی خۆشببن بە کۆڕای زانایان، ئیبن مونزر ئەو باسەی گێڕاوەتەوە، فەرمانی ئەو کەسە چەتە بکوژە نادرێتە دەست کەسوکاری کوژراوەکە، بە پێچەوانەی ئەوەی کەسێك کەسێکی تر بکوژێت بە هۆی دوژمنایەتی نێوانیان یان لەبەر کێشەیەك یان لەبەر هەر هۆکارێکی تایبەت، ئەو بکوژە خوێنەکەی بە دەست کەسوکاری کوژراوەکەیە، ویستیان دەیکوژن، و ئەگەر

ویستیان لێی خۆش دەبن، یان ویستیان پارەی خوێنێکی لێوەردەگرن، لەبەر ئەوە بۆ مەبەستێکی تایبەت کوشتوویەتی، بەڵام چەتە و ڕێگرەکان دەکوژرێن لەبەر بە تاڵان بردنی سامانی خەڵك، و لەبەر ئەوەی زیان بە ئاسایشی گشتی دەگەیەنن و هاوشێوەی دزن، و لەبەر ئەوەی سنوری خوایان بەزاندووە دەکوژرێن و هیچ جۆرە لێخۆشبوون و لێبوردنێك نایانگرێتەوە، ئەگەر بکوژەکەیش هاوتای کوژاوەکە نەبێت، بۆ نموونە: ئەگەر بکوژەکە ئازاد بێت و کوژراوەکە کۆیلە بێت، یان بکوژەکە موسڵمان بێت وکوژراوەکە لەو کەسانە بێت کە سەر وماڵیان دەپارێزرێت (ذمی)...

ئەگەر چەتە و دزەکان کۆمەڵێك بوون، تەنها کەسێکیان خەڵکی کوشتبێت ئەوانی تر یارمەتیدەر و پاسەوانی بوون، گوتراوە: تەنها بکوژەکە دەکوژرێت، بەڵام زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن هەموویان دەکوژرێن ئەگەر سەد کەسیشبن، یارمەتیدەر و ئەنجامدەری تاوانەکە وەك یەك وان، ئەوەش لە خەلیفە ڕاشدیەکانەوە گێڕدراوەتەوە، هەروەك عومەری کوڕی خەتاب رضي الله عنه ، ئەو کەسەی ڕێنمونی و چاوساغی بۆ چەتە و دز بکردایە دەیکوشت، چونکە ئەو کەسەی تاوان ئەنجام دەدات

بە هۆی چاوساغ و پاسەوان و یارمەتی دەرانییەوە ئەو کارە ئەنجام دەدات، کۆمەڵێك ئەگەر پێکەوە هاریکاری یەك بکەن هەتا هێز پەیدا دەکەن و ڕێگا لە خەڵك دەگرن، ئەو کاتە لە پاداشت و سزادا هاوەڵن...

پاشان دەڵێت: بەڵام ئەگەر کۆمەڵی چەتە و دز تەنها ماڵی خەڵکیان برد و کەسیان نەکوشت ئەو کاتە هەریەکێك لەوان دەستی ڕاستی و پێی چەپی دەبڕدرێت، بە بۆچوونی زۆربەی زانایان: وەك ئەبوحەنیفە و ئەحمەد و ئەوانی تریش، ئەوەش مانای ئەو فەرموودەی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَافٍ ﴿٣٣﴾﴾(المَائِدَة)، واتە: یان دەست وپێیان بە چەپ وڕاست ببڕدرێت.

ئەو دەستە دەبڕدرێت کە ستەمی پێکردووە و لە خەڵکی داوە، و ئەو پێیەش دەبڕدرێت کە لەسەری ڕۆیشتووە بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانە، و شوێنی دەست و پێ بڕاوەکەی بە ڕۆنی گەرم داخ دەکرێت، بۆ ئەوەی خوێنی بوەستێتەوە و نەبێتە هۆی لەناوچوونی، و دەستی دزیش هەروەهای پێدەکرێت...

لە خاچدان بەوشێوەیە هەڵبواسرێن لە شوێنێکی بەرز بۆ ئەوەی خەڵکی بیان بینێت، و تاوانەکەیان بۆ خەڵك ئاشکرا بێت، لای زۆربەی زانایان دوای کوشتنیان ئەو کارەیان پێدەکرێت، و هەندێکیان دەڵێن: دابنرێن هەتا دەمرن تا ببێتە پەند بۆ هەرکەسێك کە بیر لە ئەنجامدانی خراپەکاری دەکاتەوە، بەڵام سزادان بە لووت و گوێ بڕین دروست نییە مەگەر بە شێوەی تۆڵەسەندن بێت، عیمرانی کوڕی حصین ﵁ دەڵێت: ((ما خطَبَنا رسولُ اللهِ ﷺ إلّا أمَرنا بالصَّدَقةِ ونهانا عنِ المُثْلةِ))[1].

واتە: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گوتاری بۆ بخوێندینایە فەرمانی بەخێر و چاکە پێدەکردین، و یاساغی شێواندن و لووت و گوێ بڕینی لێدەکردین.

هەتا بێباوەڕیش دوای کوشتنی لە جەنگدا لووت و گوێی نابڕدرێت و ناشێوێندرێت، مەگەر ئەوان وایان بە کوژراوی موسڵمانان کردبێت لە تۆڵەدا هەرچیان کردبێت وایان لێدەکرێت، و تۆڵە نەکردنەوە لەم

(١). رواه أبوداود، وصححه الألباني.



بارەداشدا باشترە، وەك چۆن خوای پەوەردگار دەفەرمویێت: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ ﴿١٢٧﴾﴾(النَّحل).

واتە: ئەگەر سزاتاندا بەو شێوەیە سزا بدەن کە سزادراون، و ئەگەر ئارام بگرن ئەوە باشترە بۆ ئارامگران، ئەی پێغەمبەری خوا ئارام بگرە لەبەر خوا....

ئەگەر هاتنە سەرماڵ و چەکیان هەڵکێشا لە بیابان نەبوو بۆ بردنی ماڵ، گوتراوە: ئەوانە بە چەتە ناژمێردرێن، بەڵکو وەکو دز و تاڵانکەر لە قەڵەم دەدرێن، چونکە ئەگەر خاوەن ماڵ هاوار بکات خەڵکی بە هانایەوە دەچن، زۆربەی زانایان دەڵێن: حوکمیان لە نێو ماڵ و لە بیابانیشدا وەك یەکە، ئەو گوتەیە باوە لای مالك و شافعی و زۆربەی هاوەڵانی ئەحمەد و هەندێك لە هاوەڵانی ئەبوحەنیفەش، بەڵکو لە نێو ماڵدا زیاتر شایستەی سزادانن وەك لە بیابان، چونکە ماڵ شوێنی ئاسایش و پشوودانی خەڵکە، ماڵ جێگەی هاوکاری و یارمەتیدانی یەکترە، بەڵکو هەڵکوتانە سەر ماڵ و پێشێلکردنی حورمەتی تاوانێکی



گەورەیە و پێویستە بە توندی سزابدرێن و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت، لەبەر ئەوەی هەرچی لە ماڵدا هەیە بە تاڵانی دەبەن، و ڕێبوار زۆر جار بڕێکی کەم لە سەرمایەکەی پێیە، ئەوەش ناوکرۆکی ڕاستییە...

ئەگەر مەبەستی کوشتنی خاوەن ماڵ بوو، دروستە بۆی بەرگری لە خۆی بکات، بەڵام ئایا پێویستە لەسەری؟ زانایانی مەزهەبی ئەحمەد و ئەوانی تر دوو ڕایان هەیە، ئەمە لەکاتێکدا کە خەڵك دەوڵەتیان هەبوو، بەڵام ئەگەر پەنا بە خوا بشێوی بوو، وەك ئەوەی دوو کاربەدەستی موسڵمانان ناکۆك بوون، و لەسەر پلەوپایە شەڕیان بوو، ئایا دروستە بۆ مرۆڤ ئەگەر ڕۆیشت بۆ مەملەکەتەکەی تر، و تووشی شەڕێك بوو بەرگری لە خۆی بکات لەو بشێویە؟ لەوەشدا دوو بۆچوون هەیە لە مەزهەبی ئەحمەد وئەوانی تر.

ئەگەر دەست بەسەر چەتە وڕێگردا گیرا ماڵ و سامانی خەڵکیان بردبوو پێویستە ئەو ماڵانە بدرێتەوە خاوەنەکانیان، و سزای حەدیان بەسەردا بسەپێنرێت، هەروەها دزیش هەمان حوکمی هەیە، ئەگەر نکوڵی



هێنانەوەی ماڵە دزراوەکە یان بە تاڵان براوەکەیان کرد دوای جێگیر بوونی لە سەریان، سزا دەدرێن بە بەندکردن و لێدان، هەتا ماڵەکە دەهێننەوە یان کەسێك ڕادەسپێرن بیهێنێتەوە، یان شوێنی حەشاردانی ئاشکرا دەکات، وەك چۆن کەسێك سەرزەنشت دەکرێت و سزا دەدرێت ئەگەر واجبێك پێویست بێت لەسەری و بە ئەنجامی نەگەیەنێت، چونکە خوا لە قورئاندا بۆ پیاوی حەڵاڵ کردووە کە خێزانەکەی سەرپێچی داوا ڕەواکانی کرد لێی بدات، لێدانێك دیاری نەکات و ئێش و ئازاری زۆری پێنەگەیەنێت، هەتا ئەو مافانە بەجێ دەهێنێت، کەوابوو کەسانی چەتە و دز شایەنترن کە لێیان بدرێت تاکو ئەو مافانە دەگەڕێننەوە، داواکردنی سزادان بۆ خاوەن ماڵە ئەگەر ویستی پێیان ببەخشێت یان بیەوێت لەسەر شێوازێك ڕێك بکەوێت لەگەڵیاندا، یان لە سزادانیان خۆشببێت ئەوانەی بۆ هەیە، بە پێچەوانەی حەد کە بە هیچ شێوەیەك ناتوانرێت لێی خۆش بێت، و کاربەدەستان بۆیان نییە خاوەن ماڵەکان ناچار بکەن کە لە بەشێك لە ماڵەکەیان خۆشبن.

ئەگەر ماڵەکەیان لە ناوبردبوو بە خواردنی یان بەهەر شێوەیەکی تر گوتراوە: پێویستە کەس و خزمیان دابینی بکەن، وەك چۆن کەسێك

شتێك داگیر بكات پێویستە كەسوكاری قەرەبووی بكەنەوە، ئەوە بۆچوونی شافعی و ئەحمەدە، ئەگەر كەسێك توانای قەرەبووكردنەوەی نەبوو پێویستە ئەو كاتەی حاڵی باش دەبێت بیداتەوە، گوتراوە: نابێت پێبژاردن و دەست بڕین لەسەر یەك كەس ئەنجام بدرێت ئەوەش گوتەی ئەبوحەنیفەیە، و گوتراوە: پێویستە قەرەبوو بكاتەوە ئەگەر هەیبوو، بەڵام ئەگەر نەیبوو لەسەری پێویست نییە، ئەوەش بۆچوونی مالكە[1].

---

(١). بڕوانە: (السياسة الشرعية)(٦٢-٧٣).

## گەواهیدانی بەهەشت و دۆزەخ

**(ولا نشْهد على أهل الْقبْلَة بِعَمَل يعمله بجنة وَلَا نَار، نرجو للصالح ونخاف عَلَيْهِ ونخاف على الْمُسِيء المذنب وَنَرْجُو لَهُ رَحْمَة الله).**

**واتە: و شایەتی بەهەشت و دۆزەخ نادەین بۆ ئەهلی قیبلە لەبەر کردەوەیەك کە ئەنجامی دەدات، ئومێدمان هەیە بۆ چاکەکار و لە سەرئەنجامی دەترسین، و دەترسین لە تاوانبار و ئومێدی ڕەحمەتی خوامان هەیە بۆی.**

تەحاوی دەڵێت: ئومێدمان بە چاکەکارانی باوەڕداران هەیە کە خوا ﷻ لێیان خۆش بێت، بە ڕەحمەتی خۆی بیانخاتە بەهەشتەوە و ئەمین نین لێیان و گەواهی بەهەشتیان بۆ نادەین، داوای پۆشینی تاوان و لێخۆشبوون بۆ خراپەکارەکانیان دەکەین، لە سەرئەنجامیان دەترسین، لە ڕەحمی خوا ﷻ بێئومێدیان ناکەین[(١)].

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ

(١). بڕوانە: (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)( ٦٤-٦٥).

ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ۝٥٧﴾(الإِسْرَاء).

واتە: ئەو کەسانەی هاوبەش بڕیاردەران دەیانپەرستن و لێیان دەپاڕێنەوە لە پێغەمبەران و فریشتەکان و پیاوچاکان، خۆیان هەر هۆکار و کردەوەیەك زیاتر لە خوایان نزیك بکاتەوە پەیڕەوی دەکەن، بە ئومێدی بەزەیی خوان و دەترسن لە سزای، بێگومان سزای پەروەردگارت دەبێت خەڵك وریابن و خۆیانی لێ بپارێزن.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ۝٦٠﴾(المُؤْمِنُون).

واتە: ئەو کەسانەی دەبەخشن و هەوڵی ئەنجامدانی کردەوە باشەکان دەدەن، و دڵیان زۆر دەترسێت لێیان وەرنەگیرێت و پاداشت نەدرێنەوە کاتێك دەگەڕێنەوە لای پەروەردگاریان.

شێخ ئەلبانی: دەڵێت: شێخ ئیبن مانع: دەڵێت: بزانە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە، گەواهی نادەن بۆ هیچ کەس لە موسڵمانان کە دەمرێت بەهەشتییە یان دۆزەخییە، ئیللا ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەواهی بۆ داوە، بەڵام ئومێدی باشیان بۆ

چاکەکاران هەیە، و لە سەرئەنجامی خراپەکاران دەترسن، بەمەش دەزانین ئەوەی زۆربەی خەڵکی کاتێك باسی زانایەك یان ئەمیرێك یان پادشایەك یان جگە لەوانە دەمرێت دەڵێن: خوا لێی خۆشبوو، یان نیشتەجێی بەهەشتە، لەوە خراپتر ئەو قسەیانە کە دەڵێن: بۆ هاورێییەتی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و پیاوچاکان، گومانی تێدا نییە ئەمە قسەکردنە بە ناوی خواوە ﷻ بەبێ زانست[1].

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٦٤-٦٥).

## حوكمی ئەو كەسەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدات

(وَمن لَقِي الله بذنب يجب لَهُ النَّار تَائِبًا غير مصر عَلَيْهِ فَإِن الله يَتُوب عَلَيْهِ ويقبل التَّوْبَة عَن عباده وَيَعْفُو عَن السَّيِّئَات من لقيه وَقد أقيم عَلَيْهِ حد ذَلِك الذَّنب فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَته كَمَا جَاءَ فِي الْخَبَر عَن رَسُول الله ﷺ وَمن لقِيه مصرا غير تائب من الذُّنُوب الَّتِي اسْتوْجبَ بهَا الْعقُوبَة فَأمره إِلَى الله إِن شَاءَ عذبه وَإِن شَاءَ غفر لَهُ، وَمن لقِيه من كَافِر عذبه وَلم يغْفر لَهُ).

واتە: هەركەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ بە تاوانێك كە ئاگری بۆ پێویست كردبێت، و تەوبەی لێكردبێت و مكوڕ نەبێت لەسەری، خوا ﷻ تەوبەی لێ قەبوڵ دەكات، و تەوبەی بەندەكانی قەبوڵ دەكات، و لە تاوانەكان خۆش دەبێت.

و هەركەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای خوا حەدی ئەو تاوانەی لەسەر جێبەجێ كرابێت، ئەوە كەفارەتییەتی، وەك چۆن لە فەرموودەدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ .

**و هەرکەسێك بگەڕێتەوە مکوڕبێت لەسەر تاوانەکان کە سزایان لەسەر پێویستە و تەوبە نەکات، کاری لای خوایە ﷻ ئەگەر بیەوێت سزای دەدات، و ئەگەر بیەوێت لێی خۆش دەبێت، و هەرکەسێك بە کافری بگەڕێتەوە بۆ لای خوا سزای دەدات و لێی خۆش نابێت.**

عوبێد جابری باسی حاڵی ئەو کەسانە دەکات کە دەمرن لە باوەڕداران و بێباوەڕان، دابەشیان دەکات بۆ پێنج بەش، چواریان باوەڕدارن و یەکێکیان بێباوەڕە، دەڵێت:

یەکەم: کەسێکی باوەڕدار کە تاوانێکی ئەنجامداوە و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ تەوبەی لێکردووە، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ۝٨﴾(التَّحْرِيم).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە تەوبە بکەن و بۆ لای خوا بگەڕێنەوە تەوبەیەکی نەسوح کە جارێکی تر نەگەڕێنەوە سەر تاوان، بۆ ئەوەی خوا ئەو تەوبەیە بکاتە کەفارەتی تاوانەکانتان.

و دەفەرموێت: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١﴾(النُّور).

واتە: هەمووتان تەوبە بکەن و بۆ لای خوا بگەڕێنەوە ئەی باوەڕداران بەڵکو سەرفراز و ڕزگاربن.

و فەرموودە متواترە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەسەر قەبوڵکردنی تەوبەی بەندە، دەفەرموێت: ((إنّ اللّهَ لَيقبَلُ توبةَ العبدِ ما لَمْ يُغَرْغِرْ))[1].

واتە: بێگومان خوا تەوبەی بەندە قەبوڵ دەکات هەتاکو ڕۆحی نەگاتە قورقوڕاگەی.

دووەم: کەسێك تاوانێك ئەنجام دەدات، حەدێکی لەسەر پێویست دەکات، و حەدی لەسەر جێبەجێ دەکرێت، ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئەوە دەبێتە کەفارەتی ئەو تاوانەی، بەڵام بەڵگەکان لەسەر ئەوەن کە مکوڕ نەبێت لەسەر ئەنجامدانی ئەو تاوانە.

---

(١). أخرجه أحمد والترمذي وابن ماجه، وحسنه الألباني.

سێیەم: کەسێك حەدی لەسەر جێبەجێ دەکرێت، مکوڕ و کەللەڕەقی دەکات لەسەر ئەنجامدانی تاوانەکە، ئەم کەسە ترس هەیە لە سەرئەنجامی، و لێدانی حەد سودی پێناگەیەنێت.

چوارەم: کەسێك لە تاوانبارانی موسڵمانان، خراپەکی کردووە یان تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە و گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا مکوڕ بووە لەسەر ئەنجامدانی و تەوبەی لێنەکردووە، ئەمە ئەمری لای خوایە ﷻ، ئیمام ئەحمەد دەڵێت: ئەگەر خوا ویستی لەسەربێت لێی خۆش دەبێت و ڕەحمی پێدەکات و دەیخاتە بەهەشتەوە، و ئەگەر ویستی لەسەربێت سزای دەدات، بەڵام ئەگەر سزایدا بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا نایهێلێتەوە، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ﴿٤٨﴾﴾(النِّسَاء).

واتە: بێگومان خوا خۆش نابێت لە هاوبەش بڕیاردان، و خۆش دەبێت لە هەر تاوانێك جگە لە هاوبەش دانان بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت.

پێنجەم: کەسی بێباوەڕ لە ئاگری دۆزەخدایە[١].

---

(١). بڕوانە: (التقرير الأحمد بشرح السنة للإمام أحمد)(١٤٤.١٤٥).

## ڕەجمکردنی کەسی زیناکار

**(وَالرَّجم حق على من زنا وَقد أحصن إِذا اعْترف أَو قَامَت عَلَيْهِ بَينته وَقد رجم رَسُول الله ﷺ وَالْأَئِمَّة الراشدون).**

**واتە: ڕەجم کردن حەقە بۆ ئەو کەسەی زینا دەکات و هاوسەرگیری کردووە، ئەگەر دانیپێدا بنێت، یان بەڵگەی لەسەر ساغبێتەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕەجمی کردووە و خەلیفە ڕاشدییەکانیش ڕەجمیان کردووە.**

بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە و ئەمە لەفزی مسلمە، دەڵێت: (قالَ عُمَرُ بْنُ الخَطّابِ، وهُوَ جالِسٌ عَلى مِنبَرِ رَسُولِ الله ﷺ: إنَّ اللهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا ﷺ بِالحَقِّ، وأنْزَلَ عَلَيْهِ الكِتابَ، فَكانَ مِمّا أُنْزِلَ عَلَيْه آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْناها، ووَعَيْناها، وعَقَلْناها، فَرَجَمَ رَسُولُ الله ﷺ، ورَجَمْنا بَعْدَهُ، فَأخْشى إنْ طالَ بِالنّاسِ زَمانٌ، أنْ يَقُولَ قائِلٌ: ما نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتابِ اللهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أنْزَلَها اللهُ، وإنَّ الرَّجْمَ فِي كِتابِ اللهِ حَقٌّ، عَلى مَن زَنى، إذا أحْصَنَ، مِنَ الرِّجالِ والنِّساءِ، إذا قامَتِ البَيِّنَةُ، أوْ كانَ الحَبَلُ، أو الِاعْتِرافُ).



واتە: عومەری كوڕی خەتاب رضي الله عنه لەسەر مینبەرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، گوتی: بێگومان خوا محمدی ﷺ بە حەق نارد، و قورئانی بە سەردا دابەزاند، و لەو ئایەتانەی كە دایبەزاندە سەری ئایەتی ڕەجم بوو، خوێندمانەوە، تێگەیشتین، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی كرد، و ئێمەش دوای ئەو ڕەجممان كرد، دەترسم ماوەیەكی زۆری پێ بچێت، كەسێك بڵێت: ئایەتی ڕەجم نابینین لە كتێبی خوادا، بەوەش گومڕابن بە وازهێنان لە فەرزێك كە خوا دایبەزاندووە، بێگومان ڕەجم لە كتێبەكەی خوادا سبحانه وتعالى حەقە، بۆ ئەو كەسەی زینا بكات و هاوسەرگیری كردبێت، بۆ پیاوان و ئافرەتان، ئەگەر بەڵگەیان لەسەر ساغبێتەوە، یان ئافرەتەكە سكپڕبوو، یان دان بەو تاوانەدا بنێن.

ڕەجم بریتییە لە بەردباران كردنی ژن یان پیاو هەتاكو مردن ئەگەر هاوسەرگیریان ئەنجامدابێت و لەگەڵ خێزانەكانیان جووت بووبن، زینا تاوانێكی گەورەیە و هۆكاری تێكچوونی كۆمەڵگا و تێكەڵ بوونی نەژادەكان و زیادبوونی نەخۆشی و پەتایە، ئیبن ماجە لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی كردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان و فەرمووی: ((يا مَعْشَرَ



المُهاجِرينَ، خَمسُ خِصالٍ إذا ابتُليتُم بهنَّ وأعوذُ باللّهِ أنْ تُدرِكوهنَّ: لم تَظهَرِ الفاحِشةُ في قَومٍ قَطُّ حتى يُعلِنوا بها إلّا فَشا فيهِمُ الطّاعونُ والأوجاعُ التي لم تَكُنْ مَضَتْ في أسلافِهِمُ الذين مَضَوْا)).

واتە: ئەی کۆمەڵی کۆچەرییەکان پێنج شت هەیە پەنا دەگرم بە خوا لەوەی کە تووشی ببن و پێیان بگەن، یەکێك لەوانە: زیناکردن بڵاوببێتەوە لە نێو هەر گەلێکدا هەتا بە ئاشکرا ئەنجامی بدەن، تووشی بڵاوبوونەوەی تاعون و کۆمەڵە ئازار و نەخۆشییەك دەبنەوە کە لە نێو بابوباپیرانیاندا نەخۆشی لەو شێوەیە نەبووە.

و ئەبوداود لە جابری کوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: ((جاءَتِ اليَهُودُ بِرَجُلٍ وامْرَأةٍ مِنهُمْ زَنَيا، فَقالَ: ائْتُونِي بِأعْلَمِ رَجُلَيْنِ مِنكُمْ، فَأتَوْهُ بِابْنَيْ صُورِيا، فَنَشَدَهُما: كَيْفَ تَجِدانِ أمْرَ هَذَيْنِ فِي التَّوْراةِ؟ قالا: نَجِدُ فِي التَّوْراةِ إذا شَهِدَ أرْبَعَةٌ أنَّهُمْ رَأوْا ذَكَرَهُ فِي فَرْجِها مِثْلَ المِيلِ فِي المُكْحُلَةِ رُجِما، قالَ: فَما يَمْنَعُكُما أنْ تَرْجُمُوهُما؟ قالا: ذَهَبَ سُلْطانُنا، فَكَرِهْنا القَتْلَ، فَدَعا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالشُّهُودِ، فَجاءُوا



بِأرْبَعَةٍ، فَشَهِدُوا أنَّهُمْ رَأوْا ذَكَرَهُ فِي فَرْجِها مِثْلَ المِيلِ فِي المُكْحُلَةِ، فَأمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَجْمِهِما)).

واتە: جوولەكە پیاو و ژنێكی جوولەكەیان هێنا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: دوو لە زاناترین پیاوەكانتان بهێنن، كوڕەكانی صوریایان هێنا، پێی فەرموون: حوكمی ئەم ژن و پیاوە چییە لە تەوراتدا؟ گوتیان: ئەگەر چوار كەس شایەتییاندا كە زەكەری پیاوەكە لە فەرجی ئافرەتەكەدا بوو وەك چۆن میلی كلی چاو لە نێو كلدانەكەیە ڕەجم دەكرێن، فەرمووی: ئەی چی ڕێگرە كە ڕەجمیان بكەن؟ گوتیان: ئێمە ئێستا دەسەلأتمان نەماوە لەبەر ئەوە كوشتنمان پێناخۆشە!، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی چوار شایەتەكەی كرد، شایەتیاندا كە زەكەریان لە فەرجیدا بینیوە وەك میلی كلی چاو لە نێو كلدانەكەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد ڕەجم كران.

و مسلم لە عوبادەی كوڕی صامتەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلًا، البِكْرُ بِالبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ ونَفْيُ سَنَةٍ، والثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ، والرَّجْمُ)).

واتە: لە منەوە وەریبگرن، لە منەوە وەریبگرن، خوا دەرووی لێکردنەوە، ئەگەر کوڕێکی گەنج لەگەڵ کچێکی گەنج زینا بکات حوکمیان لێدانی سەد قامچی و دوورخستنەوە و نەفی کردنیانە بۆ ماوەی ساڵێك، و ئەگەر ژنێك کە مێردی کردبێت و پیاوێك کە ژنی هێنا بێت زینا بکەن حوکمیان لێدانی سەد قامچی و بەردباران کردنیانە هەتاکو دەمرن.

ئیبن کەسیر دەڵێت: پێشەوا ئەحمەد بۆچوونی وایە کردەوە بە فەرموودەکەی عوبادە بکرێت کە بریتییە لە کۆکردنەوەی قامچی لێدان و بەرد بارانکردنی ئەو ژنەی مێردی کردووە و ئەو پیاوەی کە ژنی هێناوە، بەڵام جمهوری زانایان بۆچوونیان وایە تەنها بەردباران دەکرێن و قامچییان لێنادرێت، دەڵێن: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ماعز و غامدییە رضي الله عنهما و دوو جوولەکەی ڕەجم کرد و لە پێشدا قامچی لێنەدان، ئەوەش بەڵگەیە کە قامچی لێدانیان واجب نییە و بەڵکو نەسخ کراوەتەوە لەسەر بۆچوونی ئەوان[1].

---

(١). (تفسير القرآن العظيم)(٢/٢٣٤).

و بوخاری و مسلم لە ئەبوهریرەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت:

((أنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَما إلى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقالَ أحَدُهُما: اقْضِ بَيْنَنا بِكِتابِ اللَّهِ، وقالَ الآخَرُ، وهُوَ أفْقَهُهُما: أجَلْ يا رَسُولَ اللَّهِ، فاقْضِ بَيْنَنا بِكِتابِ اللَّهِ وأْذَنْ لِي أنْ أتَكَلَّمَ، قالَ: تَكَلَّمْ، قالَ: إنَّ ابْنِي كانَ عَسِيفًا عَلى هَذا زَنى بِامْرَأتِهِ، فَأخْبَرُونِي أنَّ عَلى ابْنِي الرَّجْمَ، فافْتَدَيْتُ مِنهُ بِمِائَةِ شاةٍ وجارِيَةٍ لِي، ثُمَّ إنِّي سَألْتُ أهْلَ العِلْمِ، فَأخْبَرُونِي أنَّ ما عَلى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وتَغْرِيبُ عامٍ، وإنَّما الرَّجْمُ عَلى امْرَأتِهِ، فَقالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أما والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأقْضِيَنَّ بَيْنَكُما بِكِتابِ اللَّهِ، أمّا غَنَمُكَ وجارِيَتُكَ فَرَدٌّ عَلَيْكَ وجَلَدَ ابْنَهُ مِائَةً وغَرَّبَهُ عامًا، وأُمِرَ أُنَيْسٌ الأسْلَمِيُّ أنْ يَأْتِيَ امْرَأةَ الآخَرِ، فَإنِ اعْتَرَفَتْ رَجَمَها، فاعْتَرَفَتْ فَرَجَمَها)).

واتە: دوو کەس سکاڵایان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، یەکێکیان گوتی: بە قورئان حوکم بکە لە نێوانمان، و ئەوی تریان کە تێگەیشتووتربوو گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، بە قورئان حوکم بکە لە نێوانمان و ڕوخسەتم بدە قسە بکەم، فەرمووی: قسە بکە، گوتی: کوڕێکم کرێکار بوو لای ئەم پیاوە و زینای لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کرد، سەد مەڕ و بزن و کەنیزەکێکم وەك فیدیە پێدا، و پرسیارم لە زانایان کرد، پێیان گوتم: کوڕەکەی من سەد جەلدە و دوورخستنەوەی



ساڵێکی لەسەرە، و هاوسەرەکەی ئەم پیاوە دەبێت ڕەجم بکرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بە دەستە بە کتێبەکەی خوا حوکم دەکەم لە نێوانتاندا، کەنیزەك و ئاژەڵەکانت بۆ دەگەڕێتەوە، و کوڕەکەی تۆ سەد جەلدە و دوورخستنەوەی ساڵێکی لەسەرە، وئەی ئونەیس "پیاوێك بوو لە هۆزی ئەسلەم" بڕۆ بۆ لای هاوسەری ئەم پیاوە، ئەگەر دانی بە تاوانەکەیدانا ڕەجمی بکە، دانی بە تاوانەکەیدانا ڕەجمی کرد.

ئیبن تەیمییە دەڵێت: پیاوی داوێن پیس ئەگەر ژنی هێنابوو، و ئافرەتی داوێن پیس ئەگەر مێردی کردبوو بەردباران دەکرێن هەتا مردن، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ماعزی کوڕی مالکی ئەسلمی و غامدییە و دوو جولەکەکە و کەسانی تر کە تاوانی داوێن پیسیان ئەنجام دابوو بەردبارانی کردن، موسڵمانانیش دوای ئەو بەردبارانی داوێن پیسیان کردووە، زانایان ناکۆکن: ئایا پێش ئەوەی بەردباران بکرێت سەد جەلدەی لێدەدرێت؟ دوو بۆچوونی جیاواز هەیە لە مەزهەبی ئەحمەد و ئەوانی تر، بەڵام ئەگەر ژنی نەهێنا بوو، ئەوە بەپێی قورئان سەد جەلدەی لێدەدرێت، و یەك ساڵیش لەو ناوچەیە دوور دەخرێتەوە

وەك لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە، ئەگەرچی هەندێك لەزانایان دوورخستنەوەی بە واجب نازانن.

هیچ لەو سزایانە ناسەپێت تاکو چوار کەس گەواهی لەسەر نەدات، یان کەسەکە خۆی چوار جار گەواهی بدات و دان بەو تاوانەدا بنێت، لای زۆربەی زانایان، و هەندێکیان دەڵێن: تەنها یەکجار کەسەکە گەواهی لەسەر خۆی بدات ئەو سزایەی بەسەردا دەسەپێت، بەڵام ئەگەر دانی بەو تاوانەدانا و پاشان لێی پاشگەزبوویەوە، هەندێك دەڵێن: ئەو سزایەی لەسەر دەکەوێت، و هەیانە دەڵێت لەسەری ناکەوێت.

بە کەسێك دەڵێن: هاوسەردار (المحصن) کە ئازاد و پێگەیشتوو و ژیر بێت (مکلف) و جووت بووبێت لەگەڵ خێزانەکەیدا، ئەگەر بۆ تەنها یەك جاریش بێت، و ئایا مەرجە ئەو ژن و پیاوە لەو سیفەتانەی سەرەوە هاوتابن؟ زانایان دوو بۆچوونیان هەیە... ئەگەر یەکێك پێنەگەیشتووبێت (غیر بالغ) و پێگەیشتوویەك هاوسەری بێت یان بە پێچەوانەوە ئایا لە ڕیزی هاوسەرداران دێنە ئەژمار؟.

بەڵام ئەو کەسانەی کە لە ئەستۆی موسڵماناندان (أهل الذمة)، ئەوانیش هەمان حوکمی موسڵمانانیان هەیە لای زۆربەی زانایان وەك



شافعی و ئەحمەد، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دوو جولەکەی کە داوێن پیسیان کردبوو بەردبارانی کردن لەبەر دەرگای مزگەوتەکەی، ئەوەش یەکەم بەردباران کردن بوو لە ئیسلامدا.

زانایان ناکۆکن لەو ئافرەتەی کە سکی پڕە و پیاو و سیدی نییە، و هیچ گومان لەوەدا نەبێت کە ئافرەتەکە سکی پڕە، لە مەزهەبی ئەحمەد و ئەوانی تر دوو بۆچوون هەیە دەربارەی، گوتراوە: سزای حەدی لەسەر نییە، چونکە دەشێت بە زۆر سکی پڕکرابێت، یان دەشێت ئەو ئافرەتە تۆوی (منی) پیاوێکی کردبێتە گیانی خۆیەوە بەبێ ئەنجامدانی تاوانی داوێن پیسی، یان دەشێت بە هەڵە پیاوێك وایزانی بێت ژنی خۆیەتی و ئەو کارەی لەگەڵدا کردبێت، و گوتراوە سزای حەدی بەسەردا دەسەپێت، ئەمەیان لە خەلیفە ڕاشدیەکان گێڕدراوەتەوە، ولە بنەماکانی شەریعەتەوە نزیکە و بۆچوونی خەڵکی مەدینەیە، چونکە ئەگەری (الإحتمال) دەگمەن لای لێ ناکرێتەوە، وەك ئەگەری درۆکردنی، یان درۆی گەواهی دەرەکان، ئەگەر هۆکاری تاوانەکە دیار بوو.

بەڵام نێرباز هەندێك لە زانایان دەڵێن: سزای وەك سزای شەڕواڵپیسییە، گوتراوە: لەوەش کەمترە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت و



هاوەڵان لەسەری کۆکن: ئەنجامدەری تاوانەکە و ئەو کەسەی تاوانەکەی لەگەڵدا ئەنجام دەدرێت(الفاعل والمفعول به) دەکوژرێن، ئەگەر ژنیان هەبێت یان نا، چونکە خاوەن سونەنەکان لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:((مَن وجَدتُموه يَعمَلُ عملَ قومِ لوطٍ، فاقتُلوا الفاعلَ والمفعولَ به))[1].

واتە: هەرکەسێکتان بینی ئیشی گەلی لوتی دەکرد، ئەنجامدەری تاوانەکە و ئەو کەسەی تاوانەکەی لەگەڵدا ئەنجام دەدرێت بکوژن، و ئەبوداود لە ئیبن عباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە کە پرسیاری لێ کراوە: (فِي البِكْرِ يُوجَدُ عَلى اللُّوطِيَّةِ، قالَ :يُرْجَمُ).

واتە: کەسێك کە هاوسەرگیری نەکردبێت و گەنج بێت بینرا ئیشی گەلی لوتی دەکرد، دەڵێت: بەردباران دەکرێت؛ لە عەلی کوڕی ئەبو تالبیشەوە رضي الله عنه هەروەها گێڕدراوەتەوە.

---

(١). رواه أبوداود، والترمذي، وابن ماجه، وصححه الألباني.





هاوەڵان ناکۆك نین لە کوشتنی، بەڵام ناکۆکن لە جۆری کوشتنەکەی، لە ئەبوبەکری صدیقەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە: فەرمانی کردووە بە سوتاندنی، لەوانی ترەوە فەرمان کراوە بە کوشتنی و هەندێکیان دەڵێن: دیواری بە سەردا دەڕوخێنرێت هەتا دەمرێت، گوتراوە: لە پیسترین شوێندا بەند دەکرێت هەتا دەمرێت، هەندێکی تریان دەڵێن: دەبرێتە سەر بەرزترین دیواری ناوچەکە و فڕێ دەدرێتە خوارەوە، دوایی بەرد باران دەکرێت، وەك ئەوەی خوا ﷻ سزای گەلەکەی لوتی داوە بە بەردباران کردنیان، ئەمەیان لە ئیبن عەباسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ولە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: بەردباران دەکرێت، و زۆربەی پێشینان لەسەر ئەو بۆچوونەن و دەڵێن: چونکە خوا گەلەکەی لوتی بەردباران کرد، و بەردباران کردنی داوێن پیسیش لە شەریعەتدا دانراوە وەك چواندنێك بە بەردبارانکردنی گەلەکەی لوت، هەردووکیان بەردباران دەکرێن، ئەگەر ئازادبن یان کۆیلە، یان یەکێکیان کۆیلە بێت ئەویتریان ئازاد، بە مەرجێك پێگەیشتووبن، ئەگەر یەکێکیان پێنەگەیشتوو بوو ناکوژرێت بەڵام سزا دەدرێت، کەسێك پێگەیشتوو نەبێت بەردباران ناکرێت[١].

---

(١). بڕوانە: (السياسة الشرعية)(٨٣-٨٤).



## تانەدان لە هاوەڵان

**(وَمن انْتقصَ أحدا من أَصْحَاب رَسُول الله ﷺ أَو أَبغضه بِحَدَث مِنْهُ أَو ذكر مساويه كَانَ مبتدعا حَتَّى يترحم عَلَيْهِم جَمِيعًا وَيكون قلبه لَهُم سليما).**

**واتە: هەرکەسێك قسەی نەشیاو بە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێت یان ڕقی لێی بێت لەبەر کردارێ کە ئەنجامیداوە، یان باسی خراپییەکانی بکات، ئەوە موبتەدعە، هەتاکو داوای ڕەحمەتی خوا دەکات بۆ هەموویان، و دڵی سەلامەت بێت لە ڕق و کینە بەرامبەریان.**

لە پێشدا پێشەوا ئەحمەد بڕگەیەکی تری هێنا باسی فەزڵ و پلەوپایەی هاوەڵانی کرد، و لەم بڕگەیەشدا دیسان جەخت لەو بنەما گرنگە دەکاتەوە، چونکە هاوەڵان ئاینیان بە موسڵمانان گەیاندووە، و ئەمە ڕەدە لەسەر ڕەوافزەکان کە لە هەموو هاوەڵان ناڕازین چەند کەسێکی کەمیان نەبێت، و خەوارجەکان کە پێشەوا عوسمان و پێشەوا عەلییان شەهید کردن و عەلی لەگەڵیان جەنگی بەرپا کرد، و نەواصبەکان کە جنێو و قسەی نەشیاو بە هاوەڵانی ئەهل بەیت دەڵێن، تەحاوی دەڵێت: ڕقمان لە هەرکەسێکە ڕقی لە هاوەڵان بێت و بە خراپە

باسیان بکات، بە چاکە نەبێت باسیان ناکەین، خۆشویستنیان ئایین و باوەڕ و چاکەکارییە و ڕق لێبوونیان کوفر و دووڕوویی و خراپەکاری و سنوربەزاندنە[(١)].

بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا تَسُبُّوا أصحابِي، فإنَّ أحَدَكم لو أَنفَق مِثلَ أُحُدٍ ذهَبًا ما بلَغ مُدَّ أَحَدِهم ولا نَصيفَه)).

واتە: جنێو و قسەی نەشیاو بە هاوەڵانم مەڵێن، بێگومان ئەگەر کەسێکتان بە هاوشێوەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت، ناگاتە ئەوەی کەسێك لە هاوەڵان مشتێك یان نیو مشتی بەخشی بێت.

تەبەرانی و ئەبونەعیم و خەتیب لە ئیبن مەسعودەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إذا ذُكِرَ أصحابِي فأمسِكُوا)).

واتە: ئەگەر باسی هاوەڵانم کرا زمانتان بپارێزن.

عوبێد جابری دەڵێت: تانەدان لە هاوەڵان چەند شێوەیەکە:

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(٨١).

یەكەم: تانە و تەشەر و جنێویان پێ بدات بڵێت: زۆربەیان یا هەموویان كافرن و هەڵگەڕاونەتەوە، ئەمە بۆچوونی ڕافزە دوازدە ئیمامییەكانە، ئەمە كافرن بە كۆڕا.

دووەم: هەركەسێك جنێویان پێ بدات یان تانەیان لێ بدات بڵێت: هەموویان فاسقن، یان چاكەكار بوون دوای فاسق بوون، حوكمیان وەك كۆمەڵی پێشووە.

سێیەم: هەركەسێك جنێو بە هەندێكیان بڵێت، و تانە لە ئاینیان بدات، و بزانێت لەسەر حەقبووە و ئەمەش كافرە.

چوارەم: هەركەسێك تانە لە كۆمەڵێك یان هەندێك كەسیان بدات، تانە لە عەدالەت و ئاینیان نەدات، وەك وەسف كردنی موعاویە رضي الله عنه بە چروكی ئەمە فاسقی و تاوانبارییە[1].

---

(١). بڕوانە: (التقرير الأحمد بشرح السنة لإمام أحمد)(١٥٩).

## دووڕووی

**(والنفاق هُوَ الْكفْر أَن يكفر بِاللَّه ويعبد غَيره وَيظْهر الْإِسْلَام فِي الْعَلَانِيَة مثل الْمُنَافِقين الَّذين كَانُوا على عهد رَسُول الله ﷺ، وهذه الأحاديث التي جاءت: (**ثَلَاث من كن فِيهِ فَهُوَ مُنَافِق**) على التَّغْلِيظ نرويها كَمَا جَاءَت وَلَا نفسرها).**

**واته: دووڕووی کوفرە بەوەی بێباوەڕ بێت بە خوا و جگە لە خوا بپەرستێت، و لە ڕەواڵەتدا خۆی بە موسڵمان پیشان بدات، وەك دووڕووەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەم فەرموودانەی کە هاتوون: سێ شت هەیە لە هەرکەسێکدا هەبێت دووڕووە، بۆ ترساندنە و توندکردنی حوکمەکانە دەیگێڕینەوە چۆن هاتووە و تەفسیر و لێکدانەوەی بۆ ناکەین.**

نیفاق لە زماندا بەو ڕاهۆڵە (تونێل) دەگوترێت کە دوو دەرەچەی هەیە، کەسی مونافق لە زمانی کوردیدا پێی دەگوترێت دووڕوو، لای موسڵمانان خۆیان بە موسڵمان پیشان دەدەن، و ئەگەر گەڕانەوە بۆی هاوەڵەکانیان بێباوەڕی خۆیان ڕادەگەیەنن، خوا ﷻ دەربارەی ئەو

جۆرە كەسانە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾﴾(البَقَرَة).

واتە: ئەو دووڕووانە ئەگەر بگەیشتایەن بە باوەڕداران دەیانگوت: ئێمەش باوەڕمان هێناوە، و كاتێك دوور بكەوتنایەتەوە و بچوونایە بۆ لای شەیتانەكانیان كە گەورە و دەم ڕاستیان بوون دەیانگوت: ئێمە لەگەڵ ئێوەین بەڵكو ئێمە تەنها گاڵتە و یاریمان پێكردن.

ئەو جۆرە كەسانە بێباوەڕن و لە دۆزەخدا توندترین سزا دەدرێن لە پلەكانی خوارەوە، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾(النِّسَاء).

واتە: بێگومان دووڕووەكان لە چینی خوارەوەی ئاگری دۆزەخدان، و هیچ فریادڕەس و پشتیوانێك نادۆزیتەوە لەو حاڵە ڕزگاریان بكات.

ئەم ئایەتە ئاماژەی ئەوەی تێدایە كە دووڕووەكان سزایەكی زۆر سەخت دەدرێن، ئەگەرچی ئاگری دۆزەخ هەمووی سوتێنەرە بەڵام

بێگومان قوڵاییەکەی گڕوتینی زیاترە و گەرمییەکەی تاقەت پڕوکێنە، و سزای دۆزەخ هەمووی یەك چەشن و ئاست نییە، بۆچی دووڕووەکان سزایان لە بێباوەڕان سەختترە؟ چونکە لەگەڵ ئەوەی کە هاوتای بێباوەڕانن لە کوفردا، کوفرێکی زیاتریان لە بێباوەڕان تێدایە ئەویش سووکایەتی و گاڵتەکردنە بە موسڵمانان بەوەی خۆیان بە موسڵمان پیشان دەدەن و لە ناخەوە بێباوەڕن، ئالوسی دەڵێت: ﴿ٱلدَّرْكِ﴾ وەك پەیژەیە بەڵام بۆ خوارەوە، (الدرج) پلەیە بۆ سەرەوە[١].

زانایان دووڕوویان کردووە بە دوو بەشەوە، بچووك و گەورە، یان کرداری و بیروباوەڕی، دووڕووی بیروباوەڕ ئیمام ئەحمەد ئاماژەی بۆ کردووە و دەڵێت: لە ناخەوە بێباوەڕبێت و بەڕەواڵەت خۆی واپیشان بدات کە موسڵمانە، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿بَشِّرِ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ١٣٨﴾(النِّسَاء).

واتە: مژدە بدە بە دووڕووەکان کە بێگومان سزایەکی بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە.

(١). (روح المعاني)(٣/١٧٠).



و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ١٤٠﴾(النِّسَاء).

واتە: بێگومان خوا هەموو دووڕووەکان و بێباوەڕەکان لە دۆزەخدا کۆ دەکاتەوە.

و جۆری دووەم کە ئیمام ئەحمەد ئاماژەی پێکردووە و ئەو فەرموودەیەی هێناوە وەك بەڵگە لەسەری دووڕووی کرداری، ئەم جۆرەیان مرۆڤ لە بازنەی ئیسلام دەرناکات، بەڵام کۆمەڵە خەسڵەتێکی هەیە هەرکەسێك یەکێك لەو خەسڵەتانەی تێدا بێت خەسڵەتێکی دووڕووی کرداری تێدایە، و تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە، هەتاکو دەستی لێ هەڵدەگرێت و تەوبە دەکات، بوخاری و مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((أَرْبَعٌ مَن كُنَّ فِيهِ كانَ مُنافِقًا خالِصًا، ومَن كانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنهُنَّ كانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفاقِ حَتّى يَدَعَها: إذا اؤْتُمِنَ خانَ، وإذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا عاهَدَ غَدَرَ، وإذا خاصَمَ فَجَرَ)).

واتە: چوار خەسڵەت هەیە لە هەرکەسێکدا هەبن دووڕوویەکی تەواوە، و هەرکەسێك خەسڵەتێکی تێدابێت ئەوا خەسڵەتێکی کەسانی دووڕووی تێدایە هەتاکو وازی لێدەهێنێت: کاتێك قسەی کرد درۆ بکات، و پەیمانیدا ناپاکی بکات، و بەڵێنیدا نەیباتە سەر، و بەشەڕهات لە سنور دەربچێت و قسەی نەشیاو بکات.

ڕەبیع مەدخەلی دەڵێت: شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە دەڵێت: هەندێك خەڵك دووڕوویی لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کۆتای هاتووە، بەڵام ئەمە هەڵەیە، حوزەیفە رضي الله عنه دەڵێت: دووڕووی ئەمڕۆ زیاترە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتیان: چۆن؟ گوتی: دووڕووەکان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دووڕوویییەکەیان دەشاردەوە، بەڵام ئەمڕۆ دووڕوویییەکەیان ئاشکرا دەکەن.

ئێستا زۆر زۆرە بەتایبەت لە جووڵانەوە سیاسییەکان، و هەندێکیان ئەو گەواهییەیانداوە، و هەندێکیان دەڵێن: سیاسییەك ناناسم درۆ نەکات، و هەندێکی تر دەڵێن: سیاسەت دووڕووییە.

زۆرێك لە سیاسییەكانی ئەمڕۆ دووڕووی كردارییان تێدایە لە حیزبە سیاسییەكان، لە نیشانەكانی ئەم جۆرە دووڕوویيە خۆشویستنی ئەهلی بیدعەیە، و دارِشتنی مەنهەجی ترسناكە بۆ دژایەتی كردنی مەنهەجی ئەهلی سوننەت و تێكدانی، وەك: مەنهەجی موازەنات، و مەنهەجی فراوان كە هەموو ئوممەت لە خۆی بگرێت، و جگە لەوانەش لەو بنەمایانەی كە دارِێژاون بۆ دژایەتی ئەهلی سوننەت و پارێزگاری لە بیدعە و گومڕایی[1].

ئەو ئەسەرەی حوزەیفە ﵁ و قسەكانی شێخ ڕەبیع ئێستا واقعە و بە ئاشكرا كەسانێك باوەڕیان بە ئاینی خوا نییە، بەڵام لەبەر هێزی ئیسلام ناتوانن ڕاستەوخۆ بێباوەڕی خۆیان دەرببڕن بەڵام لە هەركوێدا بۆیان بلوێت تانە و تەشەر لە ئاینی ئیسلام و قورئان و پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، لەولاشەوە بانگەشەی ئەوە دەكەن كە موسڵمانی سوننە مەزهەبن، لە كاتێك گۆشتی بەراز بە باشتر دەزانن لە گۆشتی حوشتر، و كۆڕ دەگێڕن و لێكۆڵینەوە دژی ئاینی خوا ﷻ دەكەن، ئێستا زۆرێك لە

(١). (شرح أصول السنة)(١٢٠).



عەلمانی و لیبرانی دیموکراسی خواز و ڕێکخراوەکانی ژنان و قەومییەکان و هاوشێوەکانیان، و هەندێك لە ئیسلامییەکان کە ڕووخاون و هەست بە عەیبە دەکەن شانازی بە ئاینەکەیانەوە بکەن، زۆر جار ڕەخنە لە ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگرن، و هەرجارە و لە ژێر ناونیشانێکی چەواشەکارانەدا، ئەگەر ڕای گشتی موسڵمانان لیٚ هاتنە دەنگ و ڕەخنەیان لێگرتن زۆر بێشەرمانە دەڵێن لێکدانەوەی هەڵە بۆ قسەکانمان کراوە و قسەکانمان پچڕێنراوە و مەبەستمان ئەوە نەبووە، ئەوەی کە دەڵێم هەندێك لە ئیسلامییەکان بوهتان نییە بۆیان دەکەم، زۆرجار گوێبیستی ئەوە بووین بۆ نموونە دەڵێن: ڕەجم لە ئیسلامدا نییە، کە لە یەکێك لە بڕگەکانی ئەم کتێبە پێشەوا ئەحمەد هێناویەتی، و چەندان فەرموودەی صەحیحی ڕاشکاوی لەسەر هاتووە.

ئەلبانی دەڵێت: دووڕوو ئەو کەسانەن کە لە ناخەوە بێباوەڕن و بە ڕەواڵەت خۆیان بە موسڵمان پیشان دەدەن، و بێباوەڕییان لە وشەکانی سەر زاریانەوە دەردەکەوێت کە تانە لە هەندێك لە حوکمەکانی شەریعەت دەدەن و نکولی دەکەن و ڕەتی دەکەنەوە، و بانگەشەی ئەوە دەکەن پێچەوانەی عەقڵ و هەستە! پەروەردگارمان ﷻ ئاماژەی بەم

حەقیقەتە کردووە و دەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَـٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَـٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾﴾(مُحَمَّد).

واتە: دووڕووەکان ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە وایاندەزانی ئەو ڕق و کینەی لە دڵیاندایە خودا دەریناخات بۆ موسڵمانان، ئەگەر بمانەوێت ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کەسانەمان پیشان دەدایت و بەو نیشانانەی تێیاندایە دەتناسینەوە، بێگومان بەو قسانەی دێتە سەر زاریان دەیان ناسیتەوە، خوا زانایە بە هەموو کردەوەکانتان و هیچی لێ شاراوە نییە[(١)].

و زەید مەدخەلی باسی جۆرەکانی دووڕووی دەکات لە بیروباوەڕدا و دابەشی دەکات بۆ شەش بەش کە ئەمە پوختەکەیەتی:

(١). (مختصر أحكام الجنائز)(٤٨).

یەکەم: بە درۆ زانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە لە هەموو جۆرەکانی تر ڕوونترە، و لە هەموویان ترسناکترە، چونکە بە درۆزانی ئاینە بە بنەما و بەشەکانییەوە.

دووەم: ڕق لێ بوونی هەندێ لەو شەریعەتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی: ئەمەش ترسناکە بۆ موسڵمانان، هەندێك موسڵمانان لەمەدا تێکەوتون لەبەر نەفامییان بە مافی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەبینی نکوڵی هەندێك حوکم دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوییەتی و ڕەتی دەکاتەوە.

سێیەم: ڕق لێبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ.

چوارەم: ڕق لێبوونی هەندێك لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی لەبەر ئەوەی نەفسیان حەزی لێ ناکات، و تەبا نییە لەگەڵ ئارەزووە شەیتانییەکانیان و حەزە شەهوانییەکانیان.

پێنجەم: شادی و خۆشحاڵی بە لاوازی و بێهێزی ئاینەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ئاینی حەقی ئیسلامە.



شەشەم: ناخۆش حاڵی و ڕق لە سەرکەوتنی ئاینی پێغەمبەری خوا ﷺ.

و باسی جۆرەکانی دووڕووی کرداری دەکات و دابەشی دەکات بۆ هەشت بەش کە ئەمە پوختەکەیەتی:

یەکەم: درۆکردن لە کاتی قسە کردندا: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەری، باسی فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی عەمر دەکات.

دووەم: پەیمان شکێنی و پێچەوانەکردنی بەڵێن: کە لە تاوانە گەورەکانە، فەرموودەی پێشوو دیسان بەڵگەیە لەسەری.

سێیەم: خیانەت: ئەمەش تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان، ئەگەر پەیوەست بێت بە مافەکانی خوا، یان مافەکانی دروستکراوەکان، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴿٢٧﴾﴾(الأنفال).

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خیانەت و ناپاکی لە خوا و پێغەمبەرەکەی مەکەن، و خیانەت و ناپاکی لە سپاردەکانتان مەکەن،



لە کاتێکدا هیچ گومانتان نییە و دەزانن ئەوە سپاردە ئەمانەتە و دەبێت پارێزگاری لێ بکرێت[١].

هەروەها نەهیکردووە لە خیانەت لە خورەوشت و خیانەت لە سامان و خوێن و کەرامەت و ناموسی خەڵك، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أدِّ الأمانةَ إلى مَنِ ائتَمَنَك، ولا تَخُنْ مَن خانَك))[٢].

واتە: کەسێك ئەمانەتی پێدایت بۆ بگەڕێنەرەوە، و خیانەت لەو کەسە مەکە کە خیانەت لێ دەکات.

چوارەم: غەدرکردن و بێوەفایی بەرامبەر ئەو گرێبەستانەی لەگەڵ خەڵکدا کردوویەتی لە سنوری شەرعدا، دروست نییە گرێبەست

(١). تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن عەباسەوە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ﴿لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ﴾ خیانەت و ناپاکی لە خودا ﷻ مەکەن بە وازهێنان لە فەرزەکانی، ﴿وَٱلرَّسُولَ﴾ و خیانەت و ناپاکی لە پێغەمبەرەکەی ﷺ مەکەن بە وازهێنان لە سوننەتەکانی و سەرپێچی کردنی، ﴿تَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ﴾، واتە هەڵیان مەوەشێننەوە، ئەمانەت ئەو کردارانەیە کە خودا ﷻ بەندەکانی ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی پارێزگارییان لێ بکەن.

٢. أخرجه أبوداود والترمذي وصححه الألباني.

هەڵبوەشێنرێتەوە ئەگەر پاساوێکی شەرعی، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: ((آيَةُ المُنافِقِ ثَلاثٌ:إذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا وعَدَ أخْلَفَ، وإذا اؤْتُمِنَ خانَ))[1].

واتە: نیشانەی دووڕوو سێ شتە: کاتێك قسەی کرد درۆ بکات، و بەڵێنیدا نەیباتە سەر، و ئەمانەتی لادانرا خیانەتی لێ بکات.

پێنجەم: لە کاتی ناکۆکیدا مشتومڕ و جنێو و قسەی نەشیاو دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((وإذا خاصَمَ فَجَرَ)).

واتە: و بەشەڕهات لە سنور دەردەچێت و قسەی نەشیاو دەکات.

شەشەم: دواکەوتن لە نوێژی جەماعەت لە مزگەوتەکان بۆ نوێژی عیشا و نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أثْقَلَ صَلاةٍ عَلى المُنافِقِينَ صَلاةُ العِشاءِ، وصَلاةُ الفَجْرِ، ولَوْ يَعْلَمُونَ ما فِيهِما لَأتَوْهُما ولَوْ حَبْوًا...))[2].

---

١. أخرجه البخاري ومسلم.
١. أخرجه البخاري و مسلم.



واتە قورسترین و ناڕەحەتترین نوێژ لای دووڕووەکان نوێژی بەیانی و نوێژی عیشایە، ئەگەر بزانن چەند پاداشتیان تێدایە ئامادەیان دەبوون ئەگەر بە گاگۆڵکێش بێت[1].

حەوتەم: وازهێنان لە جیهاد و تێکۆشان و گفتوگۆ نەکردن لەگەڵ نەفسدا لەوبارەیەوە، دووڕووی کرداریيە، ئیمام ئەحمەد و مسلم لە ئەبوهورەیرە عبدالرحمانی کوڕی صەخری دەوسی ﵁ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەی خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن ماتَ ولَمْ يَغْزُ، ولَمْ يُحَدِّثْ به نَفْسَهُ، ماتَ على شُعْبَةٍ مِن نِفاقٍ)).

واتە: هەرکەسێك بمرێت و غەزا نەکات، و لە نەفسی خۆیدا باسی نەکات، لەسەر بەشێك لە دووڕووی مردووە.

هەشتەم: کەسێك سێ هەینی بانگ ببیستێت و نەچێت بۆ نوێژی هەینی، عبداللە کوڕی ئەبوئەوفا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

٢. جێگەی داخە ئێستا زۆرێك لە موسڵمانان کەمتەرخەمن لە ئامادەبوون بۆ ئەنجامدانی ئەو دوو نوێژە لە مزگەوت بە جەماعەت، بە تایبەت نوێژی بەیانی، ئەمە هەڕەشەیەکی ترسناکە و شایان نییە بە موسڵمان کرداری هاوشێوە دووڕووەکان بێت.



دەفەرموێت: ((من سمع النداء يَوْم الجُمُعَة ولم يأتها ثمَّ سمع النداء، ولم يأتها، ثمَّ سمع النداء ولم يأتها طبع الله عَلى قلبه فَجعل قلبه قلب مُنافِق))[1].

واتە: هەركەسێك بانگی هەینی ببیستێت و ئامادەی نوێژ نەبێت سێ جار، خوا ﷻ مۆر دەدات بەسەر دڵیدا، و دڵی دەكاتە دڵی دووڕوو[2].

١. أخرجه البيهقي وحسنه الألباني.
٢. بڕوانە: (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)(١٨٩.١٩٥).



## جۆرەكانی كوفر

(**وقَوله:** (لَا ترجعوا بعدِي كفَّارًا ضلالاً يضْرب بَعْضكُم رِقَاب بعض)، **ومَثل:** (إِذا التقى المسلمان بسيفهما فالقاتل والمقتول فِي النَّار)، **ومَثل:** (سباب الْمُسلم فسوق وقتاله كفر)، **ومَثل:** (من قَالَ لِأَخِيهِ يَا كَافِر فقد بَاء بهَا أَحدهمَا) **وَمثل** (كفر بِاللَّه تبرؤ من نسب وَإِن دق).

**وَنَحْو هَذِه الْأَحَادِيث مِمَّا قد صَحَّ وَحفظ فَإِنَّا نسلم لَهُ وَإِن لم نعلم تَفْسِيرهَا وَلَا نتكلم فِيه، وَلَا نجادل فِيه، وَلَا نفسر هَذِه الْأَحَادِيث إِلَّا مثل مَا جَاءَت لَا نردها إِلَّا بِأَحَق مِنْهَا).**

**واته: ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێت: (دوای من كافر و گومڕا مەبن هەندێكتان بدەن لە گەردنی هەندێكی ترتان)، و وەك ئەوەی دەفەرموێت: (ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێرەكانیان بە شەڕبێن بكوژ و كوژراوەكەش لە ئاگردایە)، و وەك: (جنێودان بە موسڵمان فاسقییە، و شەڕ لەگەڵ كردنی كوفرە)، و وەك: (ئەگەر كەسێك بە براكەی بڵێت: كافر، یەكێكیان گیرۆدەی ئەو حوكمە دەبن)، و وەك: (كوفر كردنە بە**

**خوا كەسێك خۆی لە ڕەچەڵەكی بەری بكات ئەگەر ئەو ڕەچەڵەكە بێرێزیش بێت).**

**و هاوشێوەی ئەم فەرموودانە كە صەحیحن و پارێزراون، ئێمە تەسلیمی ماناكانیان دەبین ئەگەر تەفسیریشی نەزانین، و قسەی تێدا ناكەین، و مشتومڕی لەسەر ناكەین، و ئەم فەرموودانە تەفسیر ناكەین ئیللا بە هاوشێوەی ئەوە نەبێت كە هاتووە، و ڕەتی ناكەینەوە ئیللا لەوە حەقتر نەبێت.**

ئەمە چەند تاوانێكە ئیمام ئەحمەد باسی كردووە كە لەو فەرموودە صەحیحانەدا هاتووە، بوخاری و مسلم لە جەریرەوە ﵁ ڕیوایەتیان كردووە: ((أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قالَ لَهُ فِي حَجَّةِ الوَداعِ: اسْتَنْصِتِ النّاسَ، فَقالَ: لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفّارًا، يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقابَ بَعْضٍ)).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاوایدا پێی فەرمووم: خەڵك بێدەنگ بكە بۆ ئەوەی گوێ بگرن، فەرمووی: دوای من كافر و گومڕا مەبن هەندێكتان بدەن لە گەردنی هەندێكی ترتان.

و بوخاری موسلم لە ئەحنەفی كوڕی قەیسەوە ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: ((ذَهَبْتُ لِأَنْصُرَ هَذا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ، فَقالَ: أَيْنَ

تُرِيدُ؟ قُلْتُ: أَنْصُرُ هَذا الرَّجُلَ، قالَ: ارْجِعْ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إذا التَقى المُسْلِمانِ بِسَيْفَيْهِما فالقاتِلُ والمَقْتُولُ فِي النّارِ، فَقُلْتُ يا رَسُولَ اللَّهِ هَذا القاتِلُ فَما بالُ المَقْتُولِ قالَ: إنَّهُ كانَ حَرِيصًا عَلى قَتْلِ صاحِبِهِ)).

واتە: ڕۆیشتم بۆ ئەوەی عەلی رضي الله عنه سەربیبخەم، ئەبوبەکرە نەفیعی کوڕی حارسم رضي الله عنه پێگەیشت، گوتی: دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟ گوتم: دەچم پاڵپشتی ئەم پیاوە دەکەم و سەریدەخەم، گوتی: بگەڕێرەوە بێگومان من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەك ببنەوە بکوژ و کوژراوەکەش لە ئاگردان، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا: بکوژەکە ئەوە حوکمێتی ئەی کوژراوەکە بۆ؟ فەرمووی: بێگومان ئەویش مکوڕ بوو هاوەڵەکەی بکوژێت.

و بوخاری موسلم لە زوبەیدەوە ڕیوایەتیان کردووە، دەڵێت: ((سَأَلْتُ أبا وائِلٍ عَنْ المُرْجِئَةِ، فَقالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ اللَّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قالَ: سِبابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ، وقِتالُهُ كُفْرٌ)).

واتە: پرسیارم لە ئەبووائل کرد سەبارەت بە مورجئە کە دەڵێن: تاوان زیانی بۆ باوەڕ نییە، یان کەم و زیاد ناکات، گوتی: ئیبن مەسعود رضي الله عنه بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: جنێودان بە موسڵمان فاسقێتییە، و شەڕ لەگەڵدا کردنی کوفرە.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَيُّما رَجُلٍ قالَ لِأَخِيهِ يا كافِرُ، فَقَدْ باءَ بِها أحَدُهُما)).

واتە: ئەگەر کەسێك بە براکەی بڵێت: کافر، یەکێکیان گیرۆدەی ئەو حوکمە دەبن.

و بەزار و دارمی لە ئەبوبەکری صدیقەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((كُفرٌ بالله تَبَرُّؤٌ من نسبٍ، وإن دقَّ)).

واتە: کوفر کردنە بە خوا کەسێك خۆی لە ڕەچەڵەکی بەری بکات ئەگەر ئەو ڕەچەڵەکە بێڕێزیش بێت.

ڕەبیع مەدخەلی دەڵێت: ئەم فەرموودانە دەهێنین و جەخت ناکەینەوە کە خاوەنی ئەو تاوانانە بێباوەڕن، بەڵکو دەوەستین، ئەمە شکۆیە بۆ فەرموودەکان، هەندێك لە سەلەف دەیانگوت: ئەم فەرموودانە تەفسیر ناکەین، و هەندێك تەفسیرییان کردووە، بۆ ئەوەی





ڕەدی خەوارجەکانی پێی بدەنەوە، چونکە خەوارج دەڵێن: هەرکەسێك نیشانەیەك لەم نیشانانەی تێدا دەربکەوێت و ئەنجامی بدات کافرە بە تەواوی، و خەڵکیان بەم تاوانانە کافر کرد، و ئێمە کافریان ناکەین، ئەو فەرموودانە بەس بۆ ترساندن و تۆقاندن دەهێنین، ئەگەر مشتومڕمان لەگەڵدا کرا بۆ خەڵکی ڕوون دەکەینەوە، ئەمە دووڕووی کردارییە، و ئەمە کوفرە لە خواری ئەو کوفرەوە کە مرۆڤ لە بازنەی ئیسلام دەردەکات، چونکە کوفر دابەش دەبێت بۆ دوو بەش: کوفری گەورە و کوفری بچووك، هەروەها دووڕوویش دابەش دەبێت بۆ دوو بەش، بچووك و گەورە، و شیرکیش دوو بەشە: گەورە و بچووك.

ئەگەر ڕووبەڕووی خەوارجە ڕۆچووەکان بووینەوە دەڵێین: ئەم تاوانانە کوفری بچووکن و موسڵمان لە بازنەی ئسلام دەرناکەن، بەڵام ئەگەر بینیمان عەوامی خەڵك فریو دەخۆن و پاڵنەریان دەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانانە، دەیانترسێنین و باسی فەرموودەکانیان بۆ دەکەین و درێژەی پێنادەین و تەفسیری ناکەین[1].

---

١. (شرح أصول السنة)(١٢٣).



## بەهەشت و دۆزەخ دروستكراون

**(وَالْجنَّة وَالنَّار مخلوقتان كَمَا جَاءَ عَن رَسُول الله ﷺ: (**دخلت الْجنَّة فَرَأَيْت قصرا**)**، **(**وَرَأَيْت الْكَوْثَر**)** **(**واطلعت فِي الْجنَّة فَرَأَيْت أَكثر أَهلهَا كَذَا... واطلعت فِي النَّار فَرَأَيْت كَذَا وَكَذَا....**)**

**فَمن زعم أَنَّهُمَا لم تخلقا فَهُوَ مكذب بِالْقُرْآنِ وَأَحَادِيث رَسُول الله ﷺ وَلَا أَحْسبهُ يُؤمن بِالْجنَّةِ وَالنَّار).**

**واتە: بەهەشت و دۆزەخ دروستكراوە وەك چۆن لە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە دەفەرموێت: (ڕۆیشتمە بەهەشتەوە و كۆشكێكم بینی) و (كەوسەرم بینی)، و (ڕوانیمە بەهەشت بینیم زۆربەی خەڵكەكەی بەوشێوەیەن... و ڕوانیمە دۆزەخ بینیم فلاّن شت و فلاّن شتم بینی).**

**هەركەسێك بانگەشەی ئەوە بكات دروست نەكراون قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەری خوای ﷺ بە ڕاست نەزانیوە، و گومانم وایە باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ نەبێت.**

بوخاری و مسلم له جابری کوڕی عبداللهوه ﷺ ڕیوایەتیان کردووه و ئەمە لەفزی مسلمە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((دَخَلْتُ الجَنَّةَ فَرَأَيْتُ فِيها دارًا أَوْ قَصْرًا، فَقُلْتُ: لِمَن هَذا؟ فَقالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الخَطّابِ، فَأرَدْتُ أنْ أدْخُلَ، فَذَكَرْتُ غَيْرَتَكَ، فَبَكى عُمَرُ وقالَ: أيْ رَسُولَ اللّهِ أوَ عَلَيْكَ يُغارُ)).

واتە: ڕۆیشتمە بەهەشتەوە، لەوێ خانوویەك یان كۆشكێكم بینی، گوتم: ئەمە بۆ كێیە؟ گوتیان بۆ عومەری كوڕی خەتابە، ویستم بچمە ژوورەوە، بیری غیرەتەكەتم كەوتەوە، عومەر گریا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا غیرەت بەرامبەر تۆ؟!.

و بوخاری له ئەنەسەوە ﷺ ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((بَيْنَما أنا أسِيرُ فِي الجَنَّةِ، إذا أنا بِنَهَرٍ، حافَتاهُ قِبابُ الدُّرِّ المُجَوَّفِ، قُلْتُ: ما هَذا يا جِبْرِيلُ؟ قالَ: هَذا الكَوْثَرُ، الَّذِي أعْطاكَ رَبُّكَ، فَإذا طِينُهُ - أوْ طِيبُهُ - مِسْكٌ أذْفَرُ)).

واتە: له كاتێكدا بە بەهەشتدا دەڕۆیشتم، ڕووبارێكم بینی، هەردوو لێوارەكەی كەپری لە دوڕی ناوبۆشی لەسەر بوو، گوتم: ئەی جبریل

ئەمە چییە؟ فەرمووی: ئەمە کەوسەرە، کە پەروەردگارت پێی بەخشیویت، قوڕەکەی یان بۆنەکەی مسکێکی زۆر بۆن خۆشە.

و بوخاری و مسلم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ((اطَّلَعْتُ فِي الجَنَّةِ فَرَأيْتُ أكْثَرَ أهْلِها الفُقَراءَ، واطَّلَعْتُ فِي النّارِ فَرَأيْتُ أكْثَرَ أهْلِها النِّساءَ)).

واتە: ڕوانیمە بەهەشت بینیم زۆربەی خەڵکەکەی هەژار بوون، و ڕوانیمە دۆزەخ بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتان بوون.

خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێت: ﴿وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾﴾(البَقَرَة).

واتە: بە ئادەممان فەرموو: خۆت و خێزانەکەت حەوا لە بەهەشتدا جێگیر و نیشتەجێبن هەرچی کات و لە هەرکوێ حەزتان لە هەرچی کرد بیخۆن و چێژببەن لە بەروبوومەکانی بەهەشت، بە ئاسودەیی و

خۆشگوزەرانی، بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەونەوە، ئەگینا لە ستەمکاران دەبن.

و دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ١٣١﴾(آلِ عِمۡرَان).

واتە: بترسن و خۆتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخ کە تاودراوە و ئامادەکراوە بۆ بێباوەڕان.

و دەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣﴾(آلِ عِمۡرَان).

واتە: پەلە بکەن بۆ بەدەست هێنانی لێخۆش بوون و پۆشینی تاوانەکانتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە و بۆ بەدەست هێنانی بەهەشتێك کە پانتاییەکەی بە قەد پانتایی ئاسمانەکان وزەوییە و ئامادە کراوە بۆ ئەو کەسانەی پارێزکار و لە خوا ترسن.

صابونی دەڵێت: ئەهلی سوننەت گەواهی دەدەن کە بەهەشت و دۆزەخ دروستکراون، و دەمێننەوە، و هەرگیز کۆتاییان نایەت، و ئەهلی





بەهەشت هەرگیز لە بەهەشت دەرناچن، و ئەهلی دۆزەخیش کە بۆ دۆزەخ دروستکراون هەرگیز لێی دەرناچن[1].

و ئیبن حەزم دەڵێت: کۆمەڵێك لە موعتەزیلە و خەوارج بۆچوونیان وایە بەهەشت و دۆزەخ دروست نەکراون، و جمهوری موسڵمانان بۆچوونیان وایە دروستکراون، و نازانین ئەو کەسانەی دەڵێن دروست نەکراوە هیچ بەڵگەیەکیان هەبێت، و هیچ بەڵگەیەك نازانین بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن: دروست نەکراون[2].

(١). (عقيدة السلف أصحاب الحديث)(٢٦٤).
(٢). (الفصل في الملل والأهواء والنحل)(٦٨/٤).



## نوێژ لەسەر مردووی ئەهلی قیبلە

**(وَمن مَاتَ من أهل الْقبْلَة موحدا يُصَلِّي عَلَيْهِ ويستغفر لَهُ وَلَا يحجب عَنهُ الاسْتِغْفَار وَلَا تتْرك الصَّلَاة عَلَيْهِ لذنب أذنبه صَغِيرا كَانَ أَو كَبِيرا أمره إِلَى الله تَعَالَى).**

**واتە: هەرکەسێك لە ئەهلی قیبلە بە تەوحیدەوە بمرێت نوێژی لەسەر دەکرێت، و داوای پۆشینی تاوان و لێخۆشبوونی لە خوا قەدەغە ناکرێت، و نوێژ لەسەر کردنی وازلێناهێنرێت، لەبەر تاوانێك کە کردوویەتی، بچووك بێت یان گەورە، فەرمانی بۆ لای خوایە ﷻ.**

ڕەبیع مەدخەلی دەڵێت: موسڵمانە تاوانبارەکان ئەگەر مردن نوێژیان لەسەر دەکەین، تاوانبارەکان ئەگەر موبتەدعیش بێت دروستە نوێژیان لەسەر بکرێت، بەڵام ئیمام بۆی هەیە نوێژی لەسەر نەکات، وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر ئەو کەسە نەکرد دزیکرد لە دەستکەوتی شەڕ پێش دابەش کردنی، فەرمووی: ((صَلُّوا على

صاحبِكم))[١]، واتە: نوێژ بکەن لەسەر هاوەڵەکەتان، و کەسێك مرد و قەرزی لەسەر بوو فەرمووی: ((صَلُّوا على صاحبِكم))[٢]، ئەبوقەتادە ﵁ گوتی من قەرزەکەی لە ئەستۆ دەگرم، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد.

و نەهیمان لێکراوە نوێژ لەسەر کافر بکەین، نوێژ لەسەر کافر و دووڕووو ناکرێت، خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ٨٤﴾(التَّوْبَة).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا هەرگیز نوێژ لەسەر هیچ مردوویەکی دووڕووەکان مەکە و لەسەر گۆڕەکەی دامەنیشە.

نوێژکردن لەسەر کافر و دووڕوو دروست نییە، بەڵام تاوانبار و موبتەدع هەتاکو لە بازنەی ئیسلامدا مابن، و شتێك هۆکاری کافر بوون بێت تێیاندا نەمان بینی بێت و بەڵگەی بەسەردا ساغ کرابێتەوە،

---

(١). أخرجه أحمد وأبوداو والنسائي وابن ماجه و صححه الألباني.
(٢). أخرجه البخاري ومسلم.

نوێژیان لەسەر دەکەین، بەڵام ئیمام و زانا بۆیان هەیە نوێژیان لەسەر نەکەن، وەك سزایەك بۆیان، بۆ ئەوەی خەڵك لە تاوانەکەی دوور کەونەوە ئەگەر تاوانبار بوو، و لە بیدعەکەی ئەگەر موبتەدع بوو، بەڵام ڕێگری لە خەڵك ناکەین نوێژی لەسەر بکەن ، بەڵکو دەڵێین: نوێژیان لەسەر بکەن[1] .

بوخاری و مسلم لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((لَمّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، جاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إلى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَهُ أنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ يُكَفِّنُ فِيهِ أباهُ، فَأَعْطاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقامَ عُمَرُ فَأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ تُصَلِّي عَلَيْهِ، وقَدْ نَهاكَ رَبُّكَ أنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ؟ فَقالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إنَّما خَيَّرَنِي اللَّهُ فَقالَ: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً ﴿٨٠﴾﴾، وسَأَزِيدُهُ عَلى السَّبْعِينَ، قالَ: إنَّهُ

(١). (شرح أصول السنة)(١٣٠-١٣١).

مُنافِقٌ، قالَ: فَصلّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأنْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾﴾(التَّوْبَة).

کاتێك عبداللەی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول مرد، عبداللەی کوڕی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پۆشاکەکەی خۆتم بدەرێ بیکەم بە کفنی باوکم و نوێژی لەسەر بکە، هەستا نوێژی لەسەر بکات عومەر رضي الله عنه پۆشاکەکەی ڕاکێشا و گوتی: ئایا خوا سبحانه وتعالى یاساغی لێ نەکردوویت نوێژ لەسەر دووڕووەکان بکەیت؟ فەرمووی: من لە نێوان دوو شتدا سەرپشك کراوم: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً ﴿٨٠﴾﴾، زیاتر لە حەفتا جار داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکەم، عومەر گوتی: ئەو دووڕووە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد، و خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾﴾(التَّوْبَة).



## سەرچاوەکان

١. (جامع البيان في تأويل القرآن)، أبو جعفر الطبري مؤسسة الرسالة، الطبعة: الأولى، ١٤٢٠هـ - ٢٠٠٠م.

٢. (الجامع لأحكام القرآن)، أبو عبد الله محمد بن أحمد القرطبي، الناشر: دار الكتب المصرية – القاهرة، الطبعة: الثانية ١٣٨٤هـ - ١٩٦٤م.

٣. (تفسير القرآن العظيم)، أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري ثم الدمشقي، دار طيبة للنشر والتوزيع، الطبعة: الثانية ١٤٢٠هـ- ١٩٩٩م.

٤. (معالم التنزيل في تفسير القرآن)، محيي السنة، أبو محمد الحسين بن مسعود البغوي، الناشر: دار طيبة للنشر والتوزيع الطبعة: الرابعة، ١٤١٧هـ- ١٩٩٧م.

٥. (دفع إيهام الاضطراب عن آيات الكتاب)، المؤلف: محمد الأمين بن محمد المختار بن عبد القادر الجكني الشنقيطي، الناشر: مكتبة ابن تيمية - القاهرة، توزيع: مكتبة الخراز – جدة، الطبعة: الأولى ١٤١٧هـ - ١٩٩٦م.

٦. (فتحُ البيان في مقاصد القرآن)، المؤلف: أبو الطيب محمد صديق خان بن حسن بن علي ابن لطف الله الحسيني البخاري القِنَّوجي، الناشر: المَكتبة العصريَّة للطبَاعة والنّشْر، صَيدَا – بَيروت، عام النشر: ١٤١٢هـ - ١٩٩٢م.



٧. (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)، أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي، دار إحياء التراث العربي - بيروت الطبعة: الثانية ١٣٩٢هـ.

٨. (فتح الباري شرح صحيح البخاري)، أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي، دار المعرفة - بيروت ١٣٧٩هـ.

٩. (مجموع الفتاوى)، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، الناشر: مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة النبوية، المملكة العربية السعودية، عام النشر: ١٤١٦هـ - ١٩٩٥م.

١٠. (فتاوى اللجنة الدائمة – المجموعة الأولى)، اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء، الناشر: رئاسة إدارة البحوث العلمية والإفتاء - الإدارة العامة للطبع – الرياض.

١١. (مجموع فتاوى ورسائل العثيمين)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين، دار الوطن - دار الثريا، الطبعة: الأخيرة - ١٤١٣هـ.

١٢. (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها)، محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة: الأولى.

١٣. (شرح سنن أبي داود)، عبد المحسن بن حمد بن العباد البدر.

١٤. (سنن الترمذي)، محمد بن عيسى بن سَوْرة بن موسى بن الضحاك، الترمذي، أبو عيسى، الناشر: شركة مكتبة ومطبعة



مصطفى البابي الحلبي – مصر، الطبعة: الثانية، ١٣٩٥هـ - ١٩٧٥م.

١٥. (صحيح ابن خزيمة)، أبو بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة بن المغيرة بن صالح بن بكر السلمي النيسابوري، الناشر: المكتب الإسلامي – بيروت.

١٦. (إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل)، محمد ناصر الدين الألباني، الناشر: المكتب الإسلامي – بيروت، الطبعة: الثانية ١٤٠٥هـ- ١٩٨٥م.

١٧. (صحيح البخاري)، محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، ناشر: دار طوق النجاة، الطبعة: الأولى، ١٤٢٢هـ.

١٨. (صحيح مسلم)، المؤلف: مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت.

١٩. (الشرح الممتع على زاد المستقنع)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين، دار النشر: دار ابن الجوزي الطبعة: الأولى، ١٤٢٢ - ١٤٢٨هـ.

٢٠. (سؤالات أبي داود للإمام أحمد بن حنبل في جرح الرواة وتعديلهم)، أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني، الناشر: مكتبة العلوم والحكم - المدينة المنورة، الطبعة: الأولى، ١٤١٤هـ.

٢١. (مسند الإمام أحمد بن حنبل)، أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل، دار الحديث – القاهرة، الطبعة: الأولى ١٤١٦هـ - ١٩٩٥م.



٢٢. (مجموع الفتاوى)، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني، الناشر: مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة النبوية، المملكة العربية السعودية، عام النشر: ١٤١٦هـ/١٩٩٥م.

٢٣. (مجموع فتاوى ورسائل العثيمين)، محمد بن صالح بن محمد العثيمين، دار الوطن - دار الثريا، الطبعة: الأخيرة - ١٤١٣هـ.

٢٤. (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة وأثرها السيئ في الأمة)، محمد ناصر الدين الألباني، دار النشر: دار المعارف، الرياض - المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤١٢هـ / ١٩٩٢م.

٢٥. (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها)، محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة: الأولى.

٢٦. (صحيح الأدب المفرد للإمام البخاري)، محمد ناصر الدين الألباني، الناشر: دار الصديق للنشر والتوزيع، الطبعة: الرابعة، ١٤١٨هـ - ١٩٩٧م.

٢٧. (الاعْتِصَام)، إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي الغرناطي الشهير بالشاطبي، الناشر: دار ابن الجوزي للنشر والتوزيع، المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م.

٢٨. (الفصل في الملل والأهواء والنحل)، أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلسي القرطبي الظاهري، الناشر: مكتبة الخانجي– القاهرة.



٢٩. (طبقات الحنابلة)، المؤلف: أبو الحسين ابن أبي يعلى، محمد بن محمد، الناشر: دار المعرفة – بيروت.

٣٠. (شرح الأربعين النووية)، المؤلف: عبد المحسن بن حمد بن عبد المحسن بن عبد الله بن حمد العباد البدر.

٣١. (فتح القدير)، المؤلف: محمد بن علي بن محمد بن عبد الله الشوكاني اليمني، الناشر: دار ابن كثير، دار الكلم الطيب - دمشق، بيروت، الطبعة: الأولى - ١٤١٤ هـ.

٣٢. (مشارق الأنوار الوهاجة ومطالع الأسرار البهاجة في شرح سنن الإمام ابن ماجه)، المؤلف: محمد بن علي بن آدم بن موسى الناشر: دار المغني، الرياض - المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤٢٧هـ - ٢٠٠٦م.

٣٣. (سبل السلام)، المؤلف: محمد بن إسماعيل بن صلاح بن محمد الحسني، الكحلاني ثم الصنعاني، الناشر: دار الحديث.

٣٤. (درء تعارض العقل والنقل)، المؤلف: تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي، الناشر: جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، المملكة العربية السعودية.

٣٥. (التحبير شرح التحرير في أصول الفقه)، المؤلف: علاء الدين أبو الحسن علي بن سليمان المرداوي الدمشقي الصالحي الحنبلي، الناشر: مكتبة الرشد - السعودية ـ الرياض.



٣٦. (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)، المؤلف: عبد الرحمن بن ناصر بن عبد الله السعدي، الناشر: مؤسسة الرسالة.

٣٧. (السياسة الشرعية)، المؤلف: تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي، الناشر: وزارة الشئون الإسلامية والأوقاف والدعوة والإرشاد - المملكة العربية السعودية الطبعة: الأولى، ١٤١٨هـ.

٣٨. (تفسير الإمام الشافعي)، المؤلف: الشافعي أبو عبد الله محمد بن إدريس بن العباس بن عثمان بن شافع بن عبد المطلب بن عبد مناف المطلبي القرشي المكي، الناشر: دار التدمرية - المملكة العربية السعودية، الطبعة الأولى: ١٤٢٧ - ٢٠٠٦م.

٣٩. (التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان وتمييز سقيمه من صحيحه، وشاذه من محفوظه)، مؤلف الأصل: محمد بن حبان بن أحمد بن حبان بن معاذ بن مَعْبدَ، التميمي، أبو حاتم، الدارمي، البُستي، ترتيب: الأمير أبو الحسن علي بن بلبان بن عبد الله، علاء الدين الفارسي الحنفي، مؤلف التعليقات الحسان: أبو عبد الرحمن محمد ناصر الدين، بن الحاج نوح بن نجاتي بن آدم، الأشقودري الألباني، الناشر: دار با وزير للنشر والتوزيع، جدة - المملكة العربية السعودية، الطبعة: الأولى، ١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٣م.

٤٠. (الصلاة وأحكام تاركها)، المؤلف: محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد شمس الدين ابن قيم الجوزية، الناشر: مكتبة الثقافة بالمدينة.

٤١. (الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان)، المؤلف: محمد بن حبان بن أحمد بن حبان بن معاذ بن مَعْبدَ، التميمي، أبو حاتم، الدارمي، البُستي، ترتيب: الأمير علاء الدين علي بن بلبان الفارسي، الناشر: مؤسسة الرسالة، بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م.

٤٢. (عقيدة السلف أصحاب الحديث)، المؤلف: أبو عثمان الصابوني، دار العاصمة، الرياض.

٤٣. (اجتماع الجيوش الإسلامية على حرب المعطلة والجهمية)، المؤلف: أبو عبد الله محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم الجوزية، الناشر: دار عالم الفوائد - مكة المكرمة، الطبعة: الأولى، ١٤٣١هـ.

٤٤. (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني)، المؤلف: شهاب الدين محمود بن عبد الله الحسيني الألوسي، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، الطبعة: الأولى، ١٤١٥هـ.

٤٥. (التعليقات اللطيفة على أصول السنة المنيفة)، المؤلف: زيد بن محمد بن المدخلي، دار الميراث النبوي، ١٤٣٨هـ،٢٠١٧م.

٤٦. (شرح أصول السنة)، المؤلف: أحمد بن يحيى النجمي، دار الميراث النبوي، ١٤٣٨هـ،٢٠١٧م.

٤٧. (شرح أصول السنة)، المؤلف: ربيع بن هادي المدخلي، دار الميراث النبوي، ١٤٣٨هـ،٢٠١٧م.



٤٨. (التقرير الأحمد بشرح أصول السنة للإمام أحمد)، المؤلف: عبيد بن عبدالله الجابري، دار الميراث النبوي، ١٤٣٨هـ،٢٠١٧م.

٤٩. (تكحيل العينين بشرح عقيدة الرازيين)، المؤلف: عبيد بن عبدالله الجابري، دار الميراث النبوي، ١٤٣٩هـ-٢٠١٨م.

٥٠. (شرح رياض الصالحين)، المؤلف: محمد بن صالح بن محمد العثيمين، الناشر: دار الوطن للنشر، الرياض.

٥١. (التعليق على رسالة رفع الأساطين)، المؤلف: محمد بن صالح العثيمين، النشر: مدار الوطن للنشر، الطبعة الأولى، ١٤٣٠هـ.

٥٢. ( شرح العقيدة الواسطية)، المؤلف: محمد بن صالح بن محمد العثيمين، الناشر: دار ابن الجوزي للنشر والتوزيع، المملكة العربية السعودية.

٥٣. (جامع العلوم والحكم في شرح خمسين حديثا من جوامع الكلم)، المؤلف: زين الدين عبد الرحمن بن أحمد بن رجب بن الحسن، السَلامي، البغدادي، ثم الدمشقي، الحنبلي، الناشر: مؤسسة الرسالة – بيروت، الطبعة: السابعة، ١٤٢٢هـ - ٢٠٠١م.

٥٤. (الإصابة في تمييز الصحابة)، المؤلف: أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت الطبعة: الأولى - ١٤١٥هـ.

٥٥. (إقامة البرهان في الرد على من أنكر خروج المهدي والدجال ونزول المسيح في آخر الزمان)، المؤلف: حمود بن عبد الله بن



حمود بن عبد الرحمن التويجري، الناشر: مكتبة المعارف، الرياض - المملكة العربية السعودية عام النشر: ١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م.

٥٦. (النبوات)، المؤلف: تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي، الناشر: أضواء السلف، الرياض، المملكة العربية السعودية الطبعة: الأولى، ١٤٢٠هـ --٢٠٠٠م.

٥٧. (الدرر السنية في الأجوبة النجدية)، المؤلف: علماء نجد الأعلام، الطبعة: السادسة، ١٤١٧هـ-١٩٩٦م.

٥٨. (شرح العقيدة الطحاوية)، المؤلف: صالح بن عبد العزيز آل الشيخ.

٥٩. (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)، المؤلف: محمد بن ناصرالدين الألباني، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع الرياض.

٦٠. (تلخيص أحكام الجنائز)، المؤلف: محمد ناصرالدبن الألباني، المكتبة الإسلامية، عمان – الأردن.



## ناوەڕۆك

